# گـونـدی خـوی، یان لـه مـەرگ خـراپتر چییـە؟

مەحموودی موعەزەمی

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

سەروەر عومەر و شاهۆ لەتیف

چاپی یەکەم
٢٠١٧

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە(٧٤٨)



## ناسنامەی کتێب

---

❖ ناوی کتێب: گوندی خوێ یان لەمەرگ خراپتر چییە؟

❖ نووسینی: مەحمود موعەزەمی

❖ وەرگێڕانی: سەروەر عومەر و شاهۆ لەتیف

❖ بەرگ: ئیبراهیم ساڵح

❖ شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج

❖ ساڵی چاپ: ٢٠١٨ سلێمانی

❖ نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم

❖ تیراژ: ١٠٠٠ دانە

---

ناونیشان:

سلێمانی ـــ سابونکەران ـــ نێوان گەراجی عوسمانی تەمین و شوقەکانی تەکییە ڕووتە.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

## چەند پرسیارێك:

**- ئایا دەخوازن ئازاد و سەربەرز بژین؟**

**- ئایا دەخوازن شاد و سەربەز بژین؟**

**- ئایا دەخوازن هەم ئازاد و سەربەز بژین و هەم شاد و بە ئومێد؟**

مەحاڵە مرۆڤێك، خێزانێك، میللەتێك، بیەوێت بگۆڕێت و بەرەو باشتربوون هەنگاو بنێت، خوای گەورە بەمیهرەبانی خۆی یارمەتی نەدات. ئەو شێوازە من بۆ بەیانکردنی بابەتەکانم هەڵمبژاردووە شێوازێکە بەناوی: (ئەکسلەرەیتد لێرنینگ accelerated learning) بە کوردی واتە: فێرکاریی خێرا.

لەم شێوازەدا من زۆر پرسیار دەکەم، بۆچی پرسیار دەکەم؟ لە زمانی ئینگلیزیدا دەستەواژەیەك هەیە کە دەڵێت:

واتە: (پرسیار لە مێشك (question hook the maind)
وەکوو قولاپ گیردەبێت.) ئێستا ئێوە هەر بابەتێك کە پێتانخۆشە دەتوانن بیری لێ بکەنەوە، هەر بابەتێك بێت ئازادن فەرموون..

- ببورە ئەمڕۆ چەند شەممەیە؟

ئایا ئێستا ئیتر بیر لەو بابەتە دەکەنەوە؟ بێگومان نەخێر. بۆچی؟ چونکە پرسیارم لێکردن. هەر کاتێك پرسیارتان لێبکرێت، مێشکتان لە هەموو بابەتێك دادەبڕێت بۆ ئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە. کەسانی سەرکەوتوو ئەوکەسانەن پرسیاری باش و پرسیاری گەورە لەخۆیان دەکەن، ئەو میللەتانە سەرکەوتوون، کە پرسیاری گەورە و پڕبەها لە خۆیان دەکەن. ئێوەش بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بن پرسیاری باش و پرسیاری گەورە لە خۆتان بکەن.

خاڵێکی دیکە کە داواتان لێ دەکەم بیکەن: دووپاتکردنەوەیە. بۆچی دووپاتکردنەوە؟ بۆئەوەی بابەتەکان لە مێشکتاندا جێگیربن. بۆچی من شێوازەی فێرکاریی خێرام هەڵبژاردووە؟ چونکە ئێوە پارەتانداوە و کاتتان تەرخانکردووە و دەتانەوێت لەم بابەتەوە شتێکی بەکەڵك و تازە فێر ببن. ئایا ئامادەن بۆ گۆڕانکارییەکی قوڵ لە ژیانتاندا؟

بەڕێزان، هەندێك ئیش کە مرۆڤ بۆ خۆی دەیکات هەستێکی بەهێز تر و جوانتری هەیە، یەکێك لەو بابەتانەی کە من خۆم زۆر بڕوام پێی هەیە بابەتی "گوندی خوێیە"، دڵنیام کە ئەم بابەتە

ژیانمان دەگۆڕێت، بەڵێنتان پێ دەدەم لە کۆتایی ئەم بابەتەدا ئێوە ئەو مرۆڤەی پێشوو نین!

لێرەدا دەمەوێت چیرۆکێکی واقعیتان بۆ بگێڕمەوە: ئەم چیرۆکە دەگەڕێتەوە بۆ سیوپێنج ساڵ بەر لە ئێستا، کە ئەو سەردەمە من خوێندکاری زانکۆ بووم، لەلایەن زانکۆی تارانەوە کۆمەڵێك لە خووێندکارەکان لە دوو پاسدا بۆ سەفرەیەکی باکوور لەڕێگای (فیروزکوه)ەوە ئامادەکراین، کاتێك کە شاری (وەرامین)مان بەجێهێشت، یەکێك لە خووێندکارەکان گوتی: "هاوڕێیان لێرە گوندێك هەیە ناوی (گوندی خوێ)یە، بابچین بیبینین" ئێمەش حەزمانکرد، سەرپەرشتەکەمان گوتی کێشە نییە، بابڕۆین گوندی خوێ ببینین.

کاتێك گەشتینە "گوندی خوێ"، ڕێك وەکوو گوندی ڕۆحەکان وابوو! خانووەکانی هەمووی لە گڵ دروستکرابوون، نە دارێکی تێدابوو، نە پەلەوەرێکی تێدابوو، نە سەگێك، نە پشیلەیەك، وشك و بیابان بوو..! دایك و کچێك سەرنجیان ڕاکێشام کە لەناو دەسکەوانێکدا بەردی خوێیان دەکوتا، پرسیم: ئەرێ ئەوانە چی دەکەن؟ گوتیان: "بەردی خوێ دەهێنن و ئینجا وردی دەکەن و دەیفرۆشن" منیش گوتم: خوێ لێرە نرخێکی وای نییە، ئەمانە دەبێت چەندێك بەردی خوێ ورد بکەن تاکوو ژیانیان بەڕێوە بچێت؟" نەدارییەکی قورس! دڵم هاتە ژان، ئێستاش کە بۆ ئێوەی دەگێڕمەوە بە تەواویی ئەو هەژاریی و داماوییە هەست پێ دەکەم

و دەنگی ئەو بایە لە گوێمدایە، زۆر ناخۆشبوو بەلامەوە و کاری تێکردم!

پاسەکەمان بەرێ کەوت و ئێمە لە ڕێگەی فیروزکوهەوە بەرەو باکوور دەڕۆیشتین، بەدەم ڕێگەوە بەردەوام بیرم سەرقاڵی ئەم بابەتە بوو، بیرم لە ژیانی ئەو دایك و کچە دەکردەوە، کاتێك گەشتینە سەر ڕێگەی باکوور، هەمووی یەکپارچە سەوزەڵانی بوو، پڕ بوو لەگوڵ و گوڵزار، بە خۆمم گوت: باشە بۆچی ئەوان ئەو شوێنە بەجێ ناهێڵن؟ بۆچی نایەن بۆ ئێرە؟ لێرە دارستانی لێیە، باڵندەی لێیە، ئاوی لێیە.. تا ئەگەر بڕیارە بشمرن لە تینواندا نەمرن، ئەم پرسیارە بەردەوام لە مێشکما دەهاتوو دەچوو.

**ئێستا ئەم پرسیارەش لە ئێوە دەکەم: بە ڕای ئێوە بۆچی ئەوان گوندی خۆییان بەجێ نەدەهێشت؟ ڕەنگە بڵێن: دەترسن، ڕاهاتوون، شوێنێکی تر نازانن، ئامانجێکیان نییە، لەو بارودۆخە ڕازین، هۆگری گوندکەیانن، نایانەوێت بگۆڕێن، بیرکردنەوەیان سنووردارە، یادەوەرییان هەیە، زانیارییان کەمە... بەڵێ ئەم وەڵامانە هەمووی ڕاستن.**

بەڵام زۆر بەداخەوە دەبێت بڵێم کە هەموومان بەجۆرێك لە جۆرەکان لە گوندی خۆیدا دەژین، بە هەر هۆکارێك بێت هەموومان لە گوندی خۆیدا دەژین، کاتێکیش خەڵکی شارێك یان وڵاتێك لە گوندی خۆیدا بژین، ئەو شار و وڵاتەش لە گوندی

خوێدایە، ئەگەر هەموو خەڵکی دنیا لە گوندی خوێدا بژین، کە بە بڕوای من لە گوندی خوێدا دەژین، ئەوکات جیهانیش لە گوندی خوێدایە، بە سەرنجدان لەو هەموو توانا و ئامرازانەی کە لەبەردەستماندان ئێمە لە گوندی خوێدا دەژین، هەموو هەوڵی من لەم بابەتەدا ئەوەیە سەرەتا گوندی خوێیەکانتان بناسن، بە هەر شێوەیەك بووە بە زووترین کات لێی وەرنە دەرەوە، چونکە کاتێکی زۆرتان نەماوە.

**پرسیاری من لە ئێوە ئەمەیە: ئایا دەتانەوێت لەگوندی خوێدا بژین یان نا؟**

ئەگەر ناتەوێت تکایە هەر ئێستا پەیمان لەگەڵ خودا ببەستن و بڵێن: خودایا، یارمەتیم بدە تا بزانم دنیا هەر ئەوە نییە کە من ناسیوومە، خودایا یارمەتیم بدە تا گوندی خوێیەکان بناسم، یارمەتیم بدە تا بە خێرایی ئەو شوێنانە بەجێ بهێڵم.

زۆر باشە، لە کوێوە بزانین لە گوندی خوێدا دەژین؟ ئەگەر لەکاتی بەڕێوەچوونی ڕێوڕەسمە ئاینییەکاندا بە شەقانەکاندا بگەڕێن بۆنموونە: دەبینن نووسراوە کۆمەڵی پرسەدارانی فلانی، دەستەی پرسەدارانی ئازەریی، کرمانی یان ئاشتیانی... دانیشتووی تاران، لە کەنەدا و ئەمریکایش دەڵێن ئێرە شوێنی کۆبوونەوەی چینییەکانە، ئێرانییەکان لەوێ کۆدەبنەوە، عەرەبەکان لێرە کۆدەبنەوە.. بۆچی ئێمە پێکەوە کۆ دەبینەوە؟ بۆچی تێکەڵی

ئەوانیتر نابین؟ لە چی دەترسین؟ لە نەناسراوەکان دەترسین، لە تەنیایی، لەوەی نەتوانین پەیوەندیان لەگەڵ ببەستین، قبوڵمان نەکەن، دەست بنێن بەڕوومانەوە، ئاسایشمان لە دەست بدەین... هتد. هەموو ئەمانەش سەرەتاکەی ترسە، ئەم ترسانەش هەمووی خەیاڵاتە، دەترسین ڕەتمانبکەوە، دەترسین بوارمان پێنەدەن، دەترسین حسابمان بۆ نەکەن، لەسەر ئەو ترسانەیە کە ئەو کۆمەڵانە دادەمەزرێنین، کە دەچینە وڵاتێکی تر خۆمان جیادەکەینەوە، دورگەیەك لە ناو زەریایەکدا دروست دەکەین، لەبری ئەوەی بچین تێکەڵیان بین و شتیان لێوە فێرببین یان فێریان بکەین، خۆمان جیا دەکەینەوە... ئەمانە گوندی خوێن، ئەو گوندی خوێیانەی لەگەڵ خۆمان دەیانبەین، لە ژێر ناوی خۆشویستنی نیشتمان و ئاین و بیروباوەڕدا، لەبری ئەوەی شتی تازە فێر بین، هەمان شتەکانی خۆمان دووبارە دەکەینەوە، سەرەتای هەموو ئەمانە چییە؟ ترسە!

ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە ئێمە پێویستە گوندی خوێکانمان بناسین و دواجار یەك بە یەك لە ناویان ببەین، ڕێگەچارەشتان پێ دەڵێم.

نیشانەکانی ژیان بەسەربردن لە گوندی خوێدا چین؟ ئەوەیە کە هەموو ڕۆژێك هەر ئەو کارانە دەکەیت کە دوێنێ ئەنجامتداوە! هەموو شەوێك هەر ئەو ئاکامەت دەبێت کە شەوی ڕابردوو هەتبوو! ژیانت دووبارەکردنەووی دووبارەیە. نا، ژیان دووبارەکردنەوەی دووبارە نییە، من گیرۆدەی گوندی خوێ بووم و دوور لە ڕووتان وەك ئەسپی ئاش هەر دەسوڕێمەوە، ژیان

دووبارەکردنەوە نییە، من شتێك دووبارە دەکەمەوە بەناوی ژیان، چونکە ژیان زۆر گەورەیە و زۆر فراوانە. با فێری ژیانکردن ببین، با تواناکانی خۆمان بناسین، بزانیین ئێمە کێین؟ فێرببین کە دنیا هەر ئەوە نییە کە من تێی گەیشتووم.

لێرەدا چیرۆکێکتان بۆ دەگێڕمەوە: من لە شوێنی کارەکەمدا حەوزێکی شووشەی ماسیم داناوە، کوڕە خاڵەکەم کاتێك دەستی کرد بە دروست کردنی ئەو حەوزانە، من لە سەرەتای کارەکەیدا و بۆ هاندانی ئەو، حەوزێکم لێ کڕی، دوو ماسیم لە ناو حەوزە شووشەییەکەدا ڕاگرتبوو بۆ ئەوەی بە تەنیا نەبن. هاوکارێکی ئینگلیزم هەبوو جارجارە بۆ کاری بازرگانی سەردانی دەکردم، ناوی جێف بوو، بەیانییەك هات بۆ نووسینگەکەم و لەکاتی قاوەخواردنەوەکەدا، بەگاڵتەوە گوتی: "مەحمود ئەم دەریاچەیەت بۆ چییە؟ پاشان پێکەنی، گوتم: جێف دەزانی ئەمەم بۆچی لێرە داناوە؟ ئەم ماسیانە وادەزانن دنیا هەر ئەم حەوزەیە! من ئەم حەوزەم لێرە داناوە و هەموو بەیانییەك سەیری دەکەم، بۆ ئەوەی بیرم نەچێت کە دنیا هەر ئەم نووسینگەی من و کۆمپانیاکەی من نییە. هەر لەبەر ئەمەیش بوو چووم بۆ هەندەران، بۆیە دەچم بۆ هەموو شوێنێك و لە هەر جیگەیەك دەرفەتێك بۆ فێربوون هەبێت بۆی دەچم. خوشکان، برایان، خۆشەویستان، بەڕێزان، دنیا هەر ژوورەکەی ئێوە نییە، دنیا نووسینەگەکەتان نییە، کۆڵانەکەتان،

شەقام و شار و وڵاتەکەتان نییە، تەنانەت کیشوەرەکەشتان نییە، دنیا زۆر گەورە ترە.

ئێستا سەلمێنراوە هەموو ئەو مادانەی لە سەرەتاوە تا هەنووکە مرۆڤ دۆزیونیەتەوە، لە سەدا دوو تا لە سەدا سێی مادەکانی دنیایە، نزیکەی لە سەدا پانزە تا لە سەدا حەڤدە، دژە مادەیە و زیاتر لە سەدا هەشتای دنیا مادەیەکە ئێمە نایناسین، شتێکە کە پێی دەڵێن مادەی تاریك، ئەمەش ڕێژەیەکی زۆرە. بەڵام ئێمە وادەزانیین دنیا هەر ئەو شوێنەیە کە ئێمە لێی دەژین و دەستبەرداری ئەم حەوزی ماسییە نابین. دنیا حەوزی ماسی نییە و من و ئێوەش ماسی نین، من ئەگەر لە جێگەی ئەو ماسییە بوومایە، بازمەیایە دەرەوە، لانیکەم لە دواین ساتەکانی ژیانمدا شتێکم جگە لە ئاو، تاقی دەکردەوە و هەست پێ دەکرد، لانیکەم شتێکم زیاتر لە ماسییەکانی تر دەزانی. (ئەمەش ئەو کارەیە کە دەبێت ئێمە بیکەین.)

ئەگەر هاوڕان لەگەڵم لە قوڵایی دڵەوە داوا لە خوا بکەن یارمەتیتان بدات، بڵێ خودایە یارمەتیم بدە تا لە شکۆ و گەورەیی ئەو جیهانەی بەدیت هێناوە تێبگەم. یارمەتیم بدە، تا لە مەزنی و شکۆمەندی ئەو جیهانەی کە لە بوونی مندا بە خەڵات پێت بەخشیووم تێبگەم، یارمەتیم بدە تا لە حەوزی شوشەی دووبارە بوونەوەی ڕۆژەکانم بێمە دەرەوە.

لە بیرم دێت، کاتێك منداڵ بووم، لە سەردەمی تەمەنی منداڵی و نەوجەوانیمدا، ئەو دایکانەی شیریان بە منداڵەکانیان دەدا لە پاش ماوەیەك دەرمانێکی تاڵیان لە مەمکیان دەدا، من زۆرم پێ سەیر بوو! لە خۆمم دەپرسی مەگەر ئەم دایکە منداڵەکەی خۆی خۆشناوێت؟ بۆچی گۆی مەمکی بۆ منداڵەکەی تاڵ دەکات؟ تا ئەم منداڵە ئیتر نەگریەت و شیر نەخوات، پاشان بۆم دەرکەوت کە عەشقی ئەو دایکە بۆ منداڵەکەی لەوەی تێگەیاندووە کە گەشەکردن و گەورەبوون لەوەدایە کە واز لە سینەی دایکی بهێنێت. ئەو منداڵە دەبێت پێ بگرێت، گەورە بێت، فێری نانخواردن ببێت. بۆ ئەمەیش چارەیەکی نییە جگە لەوەی ئەم شوێنە دڵنیاییە بەجێ بهێڵێت و لەگەڵ ترسەکانیدا ڕووبەڕوو ببێتەوە، لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا ڕووبەڕوو ببێتەوە. بچێتە ناو ژیانێکەوە کە بۆی دروستکراوە، ئەو دایکەی زۆر منداڵەکەی لە باوەش دەگرێت، ئەسڵەن منداڵەکەی پێ ناگرێت. کاتێك زۆر پشتی کەسێك بگریت پێیەکانی دەروونی لاواز دەبێت. زۆربەی ئەوانەی کە موعتاد دەبن، زۆربەی ئەوانەی لە ژیاند زۆر ناڕەحەتی دەبینن، کەسانێکن کە بۆ ژیان پەروەردە نەکراون، ناڵێم بۆ ژیان دروستنەکراون، سروشتی مرۆڤ ئەوەیە کە بژین، بەڵام ئەو جۆرە کەسانە پەروەردەنەکراون، هەرشتێکیاویستووە بە سانایی و ئاسانی بە دەستیانهێناوە، دایە گیان، بابە گیان، هەمووان لە خزمەتیدابوون، ئێستا دەبێت لەگەڵ گۆڕانەکان ڕووبەڕوو ببێتەوە،

یەکێکیشیان لە دەستدانی دایك و باوکە، ناتوانێت خۆی ڕا بهێنێت، توشی خەمۆکی دەبێت!

چ وەختێك گەورە دەبیت و پەی بە مەزتبوونی خۆت دەبەیت؟ کاتێك کە ناوچەی دڵنیایی ئێستات بەجێبهێڵیت! هەر کاتێك توانیت لەم ناوچەی دڵنیاییەت بێتە دەرەوە، تازە خەریکی گەورە دەبیت. هەرچی زیاتر بێیتە دەرەوە و زیاتر بڕۆیت زیاتر گەورەتر دەبیت. ئەمەش خەسڵەتی دنیایە، خەسڵەتی ژیانە. کاتێك گەورە دەبیت و پەی بە مەزنبوونی خۆت دەبەیت کە گۆڕانکارییەکان لە خرپترین هەلومەرجدا بە زەردەخەنیەك قبووڵ بکەیت، ئەوسا گەورە دەبیت، ئەگینا بە بچووکی دەمێنیتەوە. ئەو بازنەی دڵنیاییەی ئێمە باسی دەکەین، هێڵێکە، بۆنموونە من دەڵێم وەرە واز لەم هێڵە بهێنە و لێی وەرە دەرەوە، ئەم دیوارە چ دیوارێکە؟ ئایا بە ڕاستی دیواری ڕاستەقینەیە؟ چ شتێك ناهێڵێت من بجووڵێم؟ چ شتێك دەبێتە هۆی ئەوەی من ڕابوەستم و نەوێرم هەنگاو بنێم؟ بیرکردنەوەکانمانە، بیروباوەڕەکانمانە، ترسەکانمانە، دابوونەریت و ڕەفتارەکاننمانە، ئەو ڕەفتارانەی دەینوێنین ئەگەر تۆ بەیانیان سەعات ١٠ لە خەو هەڵسیت لە جیاتی سەعات ٥ یان ٦ یان ٨، ژیانت بە جۆرێك دەبێت، بەڵام ئەگەر مەلا بانگدان لە خەو هەڵسی جۆرێکی تر دەبێت. ئەگەر زوو بێیتەدەر لە ماڵ، ئەگەر وەرزش بکەیت، ئەگەر ئاگات لە خواردن بێت، ژیانت دەگۆڕێت، ڕەفتارەکان کاریگەریان هەیە لەسەرمان. ئاینەکان،

کولتوورەکان، بۆچی هەندێك نەتەوە دەوڵەمەندن؟ بۆچی هەندێك ئاین سەرکەوتووترن لەگەڵ ئەوەی هەمووشیان لەلایەن خودای یەکتاوە هاتوون؟ بۆچی شووێنکەوتووانی هەندێك لە ئاینەکان لاوازن و بۆ هەرشووێنێك دەچن نەخۆشی و هەژاری بەدوایانەوەیە؟ ئەم دیوارانەی ئێستا ئێمە بینیمانن کامەیان دیواریی ڕاستەقینەیە واتە بلۆك و چیمەنتۆیە؟ هیچکامیان. ئەمانە لە کوێدان؟ شووێنی ئەم بەربەستانە لە کوێدایە؟ لە مێشك و لە سەری ئێمەدان. کەواتە ڕێژەی گەورەبوون و سەرکەتنی تۆ لە کوێدا پێناسە دەکرێت؟ لە مێشکتدایە، نەوەك لە دەرەوە. زۆربەی خەڵك دەڵێن: کاکە ڕێگە نادەن من گەشە بکەم، من دەمەوێت دەوڵەمەند بم بەڵام نابم، ژنەکەم ناهێڵێت، ئەم منداڵانە ناهێڵن، دەوڵەت ناهێڵێت، ئەمریکا ناهێڵێت، ئینگلیز، یابان... هتد. ناهێڵێت. ئەمانە لە کوێدان؟ لە مێشکی ئێمەدان. دنیای دەرەوە ڕەنگدانەوەی دونیای ناوەوەیە، هەرچی بە مێشکتدا بێت درەنگ یان زوو لە دەرەوە دەیبینیت.

ئەوکەسەی کە دەڵێت من بێ شانسم، من بەدبەختم، هیچ چارەیەکی نییە جگە لەوەی لە دەرەوە بەدبەختی بدورێتەوە! ئەوکەسەی دەڵێت ناتوانم، دەی ناتوانێت. یەکێك لە گەورەکان دەڵێت: "چ ئەوانەی کە دەڵێن کە دەبێت و چ ئەوانەیش کە دەڵێن نابێت، هەردووکیان ڕاست دەکەن، بۆ ئەو دەبێت و بۆ ئەم نابێت،

چونکە وای دەوێت." (ئێمەیش بۆ ئەوە پارە خەرج ناکەین و کات و وزە بە فیڕۆ نادەین کە نەبێت، دەبێت ببێت و دەیشبێت.)

لە کۆتایی ئەم بابەتەدا، ئێوە کۆمەڵێك ڕێگا دەدۆزنەوە و دەیخەنە بەردەم مێشکتان و هەنگاوی بۆ دەنێن. نەوەك هەر تەنیا چارەنووسی خۆتان، چارەنووسی زۆر کەس دەگۆڕێت. بەڵام سەرەتای هەر گۆڕانێك لە (من)ەوەیە، ئەم منە دەبێت بگۆڕێت تا دنیا بگۆڕێت. بەڵام ئێمە چاوەڕێین کەسێکی تر بگۆڕێت، بۆ نموو بێنە بەردەم ماڵمان و پێمان بڵێن، بەڕێز ئێمە تۆمان کەشف کردووە وەرە با ئەم پارەیەت بدەینێ! ئەگەر دەتانەوێت چاوەڕوانبن، بەڵام کەس نایەت، دەعوەتنامەیەکی لەمجۆرەت هیچکات بۆنایە. گۆڕانکاییەکان لە تاك، (من)ەوە دەست پێ دەکات، چ کاتێك دەبێت دەست بە بگۆڕان بکەین؟ هەر ئێستا.

من ماوەیەك ماڵەکەم لە نزیك (باخی فولادی) بوو، نزیك (سووهانەك)، لە خوار گوندی (سوهانەك)ەوە، ماسی شەوی جەژن دوودانەم هەڵگرتبوو، پاش ماوەیەك دوای ئەوەی دوو مانگ تێپەڕی لەسەروی ماڵی ئێمەوە حەوزێکی گەورە هەبوو، ڕۆژێك مۆڵەتم لە خاوەنەکەی وەرگرت ڕێگەم بدات ئەم ماسیانە بخەمە ناو حەوزەکەوە، هەم ماسییەکان خۆشحاڵ دەبن و هەم دواجار ئەم حەوزە ماسی تیایە و ئەمانیش دەچنە پاڵ ئەوانیتر، گوتی: "باشە کێشە نیە" لەبەرئەوەی من کەسێکی هاروهاج بووم و ئیشەکانم بە ڕێکوپێکی نەدەکرد ماسییەکانم بەشووشەئاوەکەوە هەڵگرت و

چوومە ناوحەوزەکەوە، ئێوە دەزانن ماسی ئەگەر لەناکاو ئاوەکەی بگۆڕێت و لەپڕدا بیخەیتە ئاوێکی ترەوە تووشی شۆك دەبێت و دەمرێت. هەربۆیە ماسییەکانم بەشووشە ئاوەکەوە خستە ناو حەوزەئاوەکەوە، لێوارەکەی لە دەرەوەی ئاوەکە بوو بەڵام بنکەکەی لەحەوزەکەدابوو، تاوەکوو ئاوەکە هێواش هێواش هاوتابوون ئینجا وردەوردە ئاوی حەوزەکەم کردە ناوشووشەکەوە و لە ئاوی شووشەکەم ڕشت تاوەکوو لە ڕووی کیمیایشەوە وەك یەکیان لێبێت و ماسییەکان لەگەڵی ڕابێن، پاشان کاتێك ویستم دەریان بهێنم وتم با جارێ یارییەکیان لەگەڵ بکەم، شووشەکەم لە ئاوی حەوزەکەدا نوقووم کرد، پاشان شووشەکەم هێواش هێواش هەڵگێڕایەوە و هێنامە دەرەوە ماسییەکان لە ئاوی حەوزەکەدابوون، پێتوایە ماسییەکان چییان کرد؟ ماسیەکان بە ئەندازەی شووشەکە زیاتر نە دەجوڵان، پاشان کەمێك چوونە پێشەوە و گەڕانەوە، بەهەر چوارلادا دەسوڕانەوە، سەیر ئەوەبوو لەگەڵ هەر جووڵەیەکدا بەئەندازەی تیرەی شووشەکە دەچوونە پێشەوە، واتە بە یەکجار مەودایەکی زۆریان نەدەبڕی؛ جاری دواتر کە دەجوڵان دیسان بەئەندازەی تیرەی شووشەکە دەچوونە پێشەوە، چەندین و چەندین جار ئەمکارەیان دووبارەکردەوە تا بۆیان دەرکەوت ئەو دیوارە، دیواری خەیاڵی بووە!

ئێوەش هەر بەربەستێك کە لەبەر دەمتاندا دەیبینن، با پێتان بڵێم لەسەدا نەوەدوحەت تا لە سەدانەوەدوهەشت خەیاڵاتە!

خەیاڵاتی بەتاڵە. دیوارێك لەئارادا نییە، کێ ئەو دیوارەی بەدیهێناوە؟ خۆت! لەکوێدا ئەو دیوارەت دروست کردووە؟ لە سەرت، لە مێشکتدا، (کوڕی خۆم بە ئەندازەی بەرەکەت پێت ڕابکێشە!) ئەم بەرەیەی من لە کوێیە؟ کێ دەڵێت بەرەی من لێرەیە؟ کێ پێناسەی ئەم بەرەیەی کردووە؟ بۆیان پێناسەکردویت و تۆش قبوڵتکردووە! تۆ برۆ ببە بە خاوەنی هەموو دنیا، کێ دەتوانێت ڕێگەت لێ بگرێت؟ ئەم دیوارانە خەیاڵاتن، ئەو ماسیانەش نموونەکەیەتی!

ماسی، من شووێنەکەی دەگۆڕم، بەڵام ئێوە ماسی نین. ئێوە ڕووەك نین، ئێوە گوڵ نین لە باخچەیەکدا بروێنرێن، ئێوە مرۆڤن. کاتی خۆی کە ئێمە لە زانکۆ گفتووگۆمان دەکرد، هەندێك کەس بۆچوونیان وابوو دەیانگوت کاکەگیان تۆ ناتوانیت گوڵێکی سوور لە بیابانیکدا بروێنیت، تۆ ناتوانیت سوچی حەوزێکی پیس بەخاوێنی بهێڵیتەوە! ڕۆژێك بە مامۆستاکەم گوت: من بڕوام بەم قسانە نییە، ئەویش فەرمووی: ئەو بەرێزانە ڕاست دەکەن، بەڵام هەڵەی ئەم قسانە لەوەدایە کە مرۆڤ لەگەڵ گوڵی سووردا کە ناچار و بێ دەسەڵاتە و پابەندی شووێنێکە، بەهەڵە وەردەگرن!

مرۆڤ ئەو شوێنەی گەشەی تیاناکات دەتوانێت بەجێی بهێڵێت، هاوکات دەتوانێت گۆڕانکاری بکات، ئێمە گوڵی سورنین، ئێمە مرۆڤین. کۆمەڵگەیش حەوزی پیس نییە کە من بەشێك بم لێی و بمەوێت بەشێکی پاك بکەمەوە، ئەم قسانە وانین، خودی ئەو پیسی

و خودی ئەو کێشانە بۆ خۆیان خەیاڵاتن! خەیاڵاتێکن کە ئێمە دەیانگۆڕین بۆ واقیع. ئێمە دەبێت مرۆڤ بین، بەڵام مرۆڤێك نا کە بەقەد ماسییەك بیر دەکاتەوە، نەوەك مرۆڤێك کە لە گوندی خۆیدا گیری خواردووە، نەوەك مرۆڤێك کە ئاگای لە توانا بێسنوورەکانی خۆی نییە و دیلی بیروبارەکانی بووە، بەڵکوو ئەو مرۆڤەی کاتێك خوداوەند خەلقی کرد بە خۆی گوت: "فتبارك الله احسن خالقین"، ئەو مرۆڤەی کە رۆحی خودای لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، ئەو مرۆڤەی کە خوداوەند رێزی لێدەگرێت، ئەو مرۆڤەی کە کاری گەورە دەکات، ئێمە ئەوەین، دوور کەوتووینەتەوە، لە ئەسڵی خۆمان دوور کەوتوینەتەوە و هەر دەناڵێنین و خەفەت دەخۆین.

دەپرسن چی بکەین؟ یەك لە هەنگاوەکان ئەوەیە ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە، ئەمە خۆی هەنگاوێکی گەورەیە، من سەرەتا بۆ ئەم ئازایەتییەتان پیرۆزبایم لێکردن، ئێوە رێزی خۆتان گرتووە و زەحمەتتانکیشاوە و کاتتان تەرخانکردووە ئەم باتە دەخوێننەوە، ، ئەمەش ئەرزش و بەها دانانە بۆ خۆتان و سەرەتایەکی زۆر باشە.

ئایا ماسی دەتوانێت لە شووشەکەی گەورەتر ببێت؟ بێگومان ناتوانێت. باوکم لە هێنانەوەی نموونە و بەسەرهاتدا بلیمەتە، من ئێستا پێی دەزانم، بە منداڵی پێی دەگوتین: "ماسی لە دەریادا گەورە دەبێت، نەوەك لە حەوزدا، ئەگەر دەتەوێت گەورە ببیت برۆ ناو دەریاوە." یانی ئەوکاتە بە ئێمەی دەگوت لە گوندی خۆێ وەرنە دەرەوە. ئێمە هەموومان هەر وابووین، چوار برا بووین

هەموومان هەر وا بووین. بە منی دەگوت: ئەگەر سەرۆکی کۆمپانیایەکی پێنج کەسیت، بڕۆ لە کۆمپانیایەکی پێنجهەزار کەسیدا دابمەزرێ، چونکە لەو کۆمپانیا پێنجکەسییەدا تۆ لە سەروی هەمووانەوەیت، بەڵام لە کۆمپانیا پێنجهەزارکەسییەکەدا لە سەرتای رێگەدایت! ئەمەش کارێك بوو خۆی هەمیشە لە ژیانیدا دەیکرد. مەترسن، مەترسە لەوەی بڵێیت من لێرەم پێنج کەس گوێم لێ دەگرن، وەرەدەرەوە تۆ توانات هەیە، باوەڕت بە تواناکانی خۆت نەکردووە، خۆت بە کەم دەزانیت، هەر بۆیە ژیانی زۆربەمان تاڵە! لە بەیانییەوە تا ئێوارە بۆڵە بۆڵ دەکەین، هاوار دەکەین پارەم نییە، سەیارەم نییە، منداڵەکەم وا دەکات... هتد. شەو دەخەوین بەیانی هەڵدەسین و هەمان کار دووبارەدەکەینەوە! ئێوارە دیسان بەهەمان بۆڵە بۆڵ بلابلابلا... هتد. دەخەوین و بەیانی هەمان کار دووبارە دەکەینەوە! بۆچی؟ چونکە لە گوندی خوێدا گیرمان خواردووە، با هەوڵ بدەین بێینە دەرەوە، ئیتر ئەو کارانە نەکەین، سبەینێ کاری سبەینێ ئەنجام بدەین، بەم کارە سنوورەکان تێکدەشکێن، دەزانم ئەم کارە ئەنجام نادەیت چونکە دەترسیت، باشە بترسە و بەڵام ئەنجامی بدە!

ئێوە ئێستا لە شوێنێکدان کە هەست بە دڵنیایی دەکەن و ڕاهاتوون، دراوسێکەتان دەناسن، هاوڕێتان هەیە، ڕێگاکان شارەزان، دەرامەتتان دیاریکراوە، قەرزدار و خاوەن قەرز خەریکن پێکەوە دەژین... هتد. بە وردی ئەمە چی پێ دەوترێت؟ گوندی

خویێ! تکایە لەم گوندە وەرنە دەرەوە، وەرنە دەرەوە تا ببین تەواوی ئەو شتانەی ئێوە لێیاندەترسان خەیاڵات بوون!

من لە ژیانمدا ڕووداوی وام بەسەرهاتووە کە خەڵکی دیکەی لێك هەڵدەوەشاند، بەڵام وەزعی منی باشتردەکرد، یانی هەر چەند سەیردەکەم هەر ڕووداوێکم بەسەرهاتووە لە سەرەتاوە ترسناك بووە، بەڵام من بە باوەڕی خۆم خودای مەزن و میهرەبان، بە سۆز و میهرەبانییەکەی خۆی، منی هەڵداوەتە شوێنێکی ترەوە، ناڕازی بووم، کەچی شووێنیکی باشبوو، پاشان سەیرەکەم ئێرە چەند شووێنێکی باشە، هەروا بۆ خۆن ڕادەوەستم سەیر دەکەم، لەناکاو لەقەیەکم بەردەکەوێت هەڵدەدرێمە شوێنێکی ترەوە، لە شوێنی پێترم باشترە! ڕێگە بدەن لەقەتان لێ بدەن، ڕێگە بدەن بە پشتەملتاندا بکێشن، بەڵام بەو مەرجەی هەڵتان بدەنە دەرەوە، نەوەك بکێشن بەسەرتاندا و هەر لە جیگەی خۆت بمێنیتەوە، بەڕەکەی تۆ بە ئەندازەی دونیایە! بەرەکەی تۆ بە ئەندازەی یەك دونیایە هەرچەندە دەتوانیت سوودی لێوەربگرە!

ئێمە زیندانین! زیندانی بیرکردنەوە، زیندانی باوەڕ، زیندانی ڕەفتار، زیندانی تەنانەت جل و بەرگ پۆشینمان، خواردن و قژداهێنانمان، هەموویان بوون بە عادەت! من کەسێکی خۆشەویستم هەیە لە خێزانەکەماندا، پێی دەڵێم بۆچی فلان خواردن ناخۆیت! دەڵێت: بۆچی مەگەر دایك و باوکم خواردییانە تا من بیخۆم؟! گوتم: دەی ئەوان (ئەنتی بایتیك)یان نەخواردووە

تۆیش مەیخۆ، ئەوان پزیشکیان نەبوو تۆش با نەتبێت. لە گوندی خۆیدا گیرماغخواردووە!

هەواڵێکی ناخۆشم پێیە بۆتان: ئەی مرۆڤ تۆ زیندانییت، زیندانێکیی زیندانێك کە پاسەوانی زیندانەکە، دادوەر، پارێزەرە بێدەسەڵاتەکەی و تەواوی ئەو کەسانەی لەو سیستەمەدا ئیش دەکەن، خۆتی! تۆ دیلی، دیلێك کە ئەگەر بییەوێت ڕا بکات، پاسەوانەکەی زووتر لە ئەو پێی دەزانێت! ڕێگەی هەڵهاتنت نییە، چونکە خۆت، خۆتت دیل کردووە! دەشتەوێت یەکێك بێت ڕزگارت بکات! ئەستەمە، هەوڵ دەدەیت بێیتە دەرەوە، بەڵام یەکێك قاچی گرتوویت، ئێی دەتەوێت ڕا بکەیت؟ دەزانم دەتەوێت ڕا بکەیت، زیندانەکەت توندتر دەبێت! بەڵام ڕۆژێك دەبێت ڕزگارت ببێت، ئەو ڕۆژە کەیە؟ "ئێستا"یە، دەبێت ئەم دیوارانە بڕوخێنن: دیواری نەریت، دیواری، کلتور، دیواری ڕەفتار، دیواری ئیحساس... دەبێت هەموویان بڕوخێنن، تا بتوانیت ئازاد بیت، تا ببیت بەو کەسەی کە خودا بەدیهێناویت، ببیت بەو کەسەی کە بۆ ئەو مەبەستە بەدی هێنراویت، نەوەك بگریت بۆ شتێکی بچووك، کاتێك کە خاوەنی هەموو دنیایت! کاتێك خودات لەگەڵتدایە، کاتێك هەموو بوونەوەر چاوەڕێی ئەوەیە تا تۆ داوای شتێکی لێ بکەیت!

ئایا دەتەوێت ئازاد بیت یان نا؟ ئەگەر بتەویت، دەتوانیت، (ادعونی استجب لکم) خوای گەورە گوێبیستی پەیامی ئێوەیە،

دەست بەرز بکەنەوە و داوای لێ بکەن یارمەتیتان بدات، خودا یارمەتیتان دەدات.

ئەو دیوارەی کە دەبێت بڕوخێت ناوی دیواری ترسە! کاتێك کە دیواری ترسەکانتان ڕووخا، دەبینن کە هەمووتان پادشا و پێشەوان! هەروەك مەولانای ڕۆمی دەڵێت: "یەکی پاچێك هەڵبگرن بۆ هەڵکەندنی زیندان، هەر کە زیندانەکەتان بڕی، هەمووتان پادشا و پێشەوان، بمرن، بمرن، لەم نەفسە دابببڕێن، کە ئەم نەفسە وەك بەندە و ئێوەش وەکوو بەندی وان!"

ئەو نەفسەی کە باسی دەکەین هەر ئەم ترسانەیە، ئەم شێعرەی مەولانا بخوێننەوە، ئێوەیش بڕیارتانداوە بۆ هەڵکەندنی ئەم زیندانە، چالێك دروست بکەن و بێنەدەرەوە، ئەو دیوارە دیواری ترسە! ئێمە ئەمڕۆ فێردەبین کە ئەم ترسانە چۆن دروست دەبن و من و تۆ چۆن دەتوانین چالێك هەڵبکەنین بۆ هەمیشە لێی بێینە دەرەوە، دێوارێکی تر ئەویش دەبرین، یەکیکی تریش دەبڕین، ئەوی تریش دەبڕین... تا کاتێك ئێمە زیندووین، دەگۆڕێن، تا کاتێك زیندووین، فێردەبین، تا کاتێك زیندووین، خۆمان نیشاندەدەین و ڕێگە دەدەین ئەوانیتریش خۆیان نیشان بدەن، خۆمان نیشان دەدین، نەك بە قسە، بە کردەوە.

لە بیرتان نەچێت ئەگەر دەتانەوێت یارمەتی هەژاران بدەن تکایە بەشێك مەبن لەوان، ئەگەر دەتانەوێت یارمەتی نەخۆشەکان بدەن تکاتان لێ دەکەم بەشێك مەبن لەوان. پاسێك وەردەگەڕێت،

ژمارەیەك سەرنشیت دەمرن، ژمارەیەکیش بریندار دەبن، ژمارەیەکی تریش بە سەلامەتی دەردەچن، کام دەستەیە دەتوانێت یارمەتی ئەوانیتر بدات؟

بێگوومان ئەوانەی کە بەسەلامەتی دەرچوون، تکایە سەلامەت بن، ژمارەیەك کەس دەردەدارن، داماون، ناتوانن، هەژارن، دەسەڵاتیان نییە، بارودۆخیان ڕێگەیان پێنادات، چ کەسێك دەتوانێت یارمەتییان بدات؟ ئەوەی کە هەیەتی، گۆزە هەر ئەوەی لێدێتە دەرەوە کە تیایەتی، گۆزەی بوونتان بە سامان، بە بەرەکەت، بە خۆشەویستی و ڕەفتاری جوان پڕ بکەن، ئەو کات دنیا دەست بە گۆڕان دەکات، خاڵی سەرەتاکەی لە کوێدایە و لەکوێ دەست پێ دەکات؟ لە (من)ەوە، ئاواهی دەتوانیت دنیا بگۆڕیت، نەوەك چەك هەڵبگریت و بکەویتە گیانی ئەم و ئەو! لە خۆتەوە دەست پێ بکە، ئەوە بە، کە دەیڵێیت، ئەمە باشترین ڕێگایە. ئێوە گوێ لە قسەی چ کەسانێك دەگرن؟ باوەڕتان بەچی هەیە؟ پەیڕەوی چ ئاینێکن؟ ئەو ئاینەی کە ڕابەرەکەی ئەوەی دەکرد کە خۆی دەیگوت، هەرگیز درۆی نەکرد، بەڵام شووێنکەوتووانی دوای هەزار و چوارسەد ساڵ، وەك خۆڵی بیابان درۆ دەکەن، کەچی باوەڕیشیان بەوە هەیە کە درۆزن دوژمنی خوایە!

دەڵێن غەیبەتکردن وەکوو ئەوە وایە گۆشتی براکەت بە مردوویی بخۆیت، بەڵام من پێتان نیشان دەدەم کە ڕۆژی چەندین

ملیۆن تەن گۆشتی برای مردوو بەو پەڕی لەزەتەوە دەخورێت!.
بۆچی؟ چونکە لە گوندی خوێدا گیرمانخواردووە! چونکە نە لە خۆمان و نە لە وانیتر و نە لە دنیا تێگەیشتووین! کێشە نییە، ئێستا ڕوونی دەکەینەوە، ئەسڵەن هیچ شتێك لەم دنیایەدا بێ هۆکار نییە، ئێوە لە خۆوە لێرە نین، من لە خۆوە لێرە نیم، کارەبا لە خۆوە نییە، هەموو ئەم شتانە بۆ ئەوەن کە تۆ بگۆڕێیت، دەبێت ئەم پێستە فڕێ بدەیت و بێتە دەرەوە و دنیا بگۆڕیت، ئەوەی دنیا پێشکەشی کردویت بۆچییە؟ دنیا کارەبا، پزیشك، ئاو، چارەسەر، ئەم هەموو پۆلیسە، ئەم هەموو ڕێگەوبانە... هتد. پێشکەکردوم، هەموو ئەمانە لە کاردان بۆ ئەوەی من بژیم، ئەمانە بەرهەمی ئەوانیترن بۆ من، من چیم پێیە بۆ ئەم نیشتیمانە؟ من چیم پێیە بۆ خیزانەکەم، من چیم پێیە بۆ ئەم دنیا؟ پرسیار لە خۆت بکە؟ لە سەرەتای بابەتەکەوە گوتم: کەسانی گەورە ئەوانەن کە پرسیاری گەورە لە خۆیان دەکەن، پرسیار لە خۆت بکە و بڵێ بەرهەمی من بۆ ئەم دنیایە چییە؟ من دەچمە ناو ئەم فەرمانگەیە، ناو ئەم کارگەیە، ئەم نوسینگەیە، ئەمڕۆ چ گۆڕانکارییەك دەتوانم لە دنیادا بکەم؟ چۆن دەتوانم کەسێکی بەسوودتر بم بۆ خۆم و بۆ ئەوانیتریش؟ ئەم پرسیارە لە خۆت بکە، وەڵامەکەی وەردەگریتەوە، شەوان ئاسوودەتر دەخەویت.

دوو پێناسە و دوو عیبارەت هەیە کە پێویستە باسی بکەم تا پاشان بزانن ئێوە چەندێك تواناتان هەیە: یەکەمیان عیبارەتی

ناسراوی (ئازادی)یە، عیبارەتێکی تر هەیە کە ئێمە کەمتر باسی دەکەین ناوی (ئازادبوون)ە، ئازادی ئەو شتەیە کە ئەوانیتر بە من و تۆی دەدەن، یاسا پێمان دەدات، کۆمەڵگە پێمان دەدات، بۆ نموونە من ئازادم لە ناهەنگێکدا هەڵپەرم، بەڵام ئازاد نیم لە گڵۆپی سووری ترافیك بدەم، یاسا پێم دەڵێت هەرکاتێك گڵۆپەکە سەوز بوو، برۆ، ئەمەیان لە دەرەوە دێت، دەبێت گوێی لێ بگریت و سنووردارمان دەکات، ئەسڵەن ئازادی یانی ڕێزگرتن لە یاسا، ئێمە پێمان وایە کە ئازاد بووین، هەر کارێك کە پێمان خۆش بوو دەتوانین بیکەین! ئازادی واتە ڕێزگرتن لە یاسا، بەڵام ئازادبوون کارێکە لە ناخی تۆوە سەرچاوە دەگرێت، لە ناخی تۆوە دێتە دەرەوە، ئازادییەکە کە خۆت بە خۆتی دەبەخشیت، مەترسە لەو گوندی خوێیە وەرە دەرەوە. دیلی بیروباوەڕ و بیرکردنەوەکانت مەبە. لە کۆتایی ئەم بابەتەدا جوان ڕاڤەی دەکەم کە چییە. ئازادبوون کەس ناتوانێت پێتی ببەخشێت و کەسیش ناتوانێت لێتی زەوت بکات! ئازادبوون خەسڵەتێکی ئینسانییە، دەتوانیت جەستە و بوونی کەسێك لەناو ببەیت، بەڵام ناتوانیت ڕۆحی لەناو ببەیت، ناتوانی قسەکەی لەناو ببەیت، ئەمە موڵکی مرۆڤە، موڵکی تۆیە، ئەگەر ئازادبیت درۆ ناکەیت، ئەگەر ئازادیت زیاد بێت و ئاستت بەرز ببێتەوە، گۆشتی براکەت بە مردوویی ناخۆیت، ئەگەر ئازادبوونت بەڕادەی پێویست گەشەی کردبێت، ئیتر درۆ ناکەیت. بۆچی درۆ بکەم؟ چ پێویست دەکات؟ کاتێك

دەتوانیت ئەمە بکەیت کە ئازادبوونت پەروەردە بکەیت، ئەمڕۆ ڕۆژێکە لەگەڵ ڕێزگرتن لەو یاسایانەی لە ناویاندا دەژین و لەگەڵ هەندێکیاندا نین، بەڵام ڕێزیشیان دەگرین، واتە دەتوانین گەشەی پێ بدەین تا بگات بە هاوسەر و بە منداڵەکانمان، بە شووێنی کارەکانمان و بە تاکەکان، دەبێت کارێك بکەین ئەوان لە بوونی خۆیان خۆشحاڵ بن.

بۆچی لەسەر بیروباڕەکانمان دەنگەدەنگ و شەڕ دەکەین،؟ بۆچی پەلاماری یەکتری دەدەین؟ بۆچی ژن و پیاوەکان چەندین سەعات لەسەر بابەتێك شەڕ دەکەن؟ دەیانەوێت چی بسەلمێنن؟ دەیانەوێت بیسەلمێنن کە من لەسەر حەقم؟ چ پیاو، چ ژن، ژیانی خۆی تێك دەدات، هاوسەر و منداڵەکانی زەلیل دەکات، دەیەوێت بیسەلمێنێت کە من لەسەر حەقم! دەی ئەم کەسە دیلە! ئەم لە ئازادبوون تێنەگەیشتووە! بەڕێزان، ئازیزان، ئێمە کاتێك دەنگە دەنگ دەکەین بۆ ئەوەی قەناعەت بە کەسێك بکەین، ئامانجی ئێمە ئەوە نییە کە کەسێك ئازاد بکەین، ئامانجمان ئەوەیە کە پێی بڵێین لە زیندانەکەی خۆت وەرە دەرەوە و تکایە وەرە ناو زیندانەکەی منەوە! بەرگریی لە چی دەکەیت؟ لە بیروباوەڕەکەم، بیروباوەڕەکەم!

با لێرەدا ئەم چیرۆکەتان بۆ بگێرمەوە: یەکێك لە هاوڕێکانم بانگهێشتی کردم بۆ (کلاردشت) تەلەفونی بۆ کردم گوتی: "بەڕێز موعەزەمی من و خێزانەکەم هاتووین بۆ ئێرە ئەگەر دەکرێت

ئێوەش بە خێزانی وەرن" گوتم: "نا ئەگەر دەکرێت ئێوە وەرن بۆ
ئێرە، ئێمە جێگەمان زۆرە و ژووری زیادەشمان هەیە، گوتی: "نا
ئەگەر مۆڵەتمان بدەنێ حەز دەکەین ئێمە میوانداری ئێوە بکەین
شوێنێکیشمان گرتووە، نیوەڕۆ چووین بۆ ئەوێ و پێشوازییان
لێکردین، خێزانیکی گەورە و قەرەباڵغیش بوون، پاشان کە
نانمانخوارد، گوتیان: "بەڕێز موعەزەمی دەکرێت تکات لێ بکەین
کەمێك ئامۆژگاریمان بکەیت؟" منیش دەستمکرد بە پێکەنین و
گوتم: "من ئامۆژگاری ئێوە بکەم؟ یانی چی؟ مەگەر من چیم تا
ئامۆژگاری ئێوە بکەم؟" گوتیان: نا کەمێك قسەمان بۆ بکە"
منیش گوتم: "چ قسەیەکتان بۆ بکەم؟" پاشان ئەو پیاوە بە منی
گوت: "ئەم خوشکەی من توشی شێرپەنجەی سینگ بووە، ئەم
منداڵانە لەگەڵ باوکیان شەڕیانە و ئەم خێزانە خەریکە لێك
هەڵدەوەشێت، هەرجۆرێك بووە کارێك بکە ئەمانە پێکە ڕێك
بکەونەوە" گوتم: "باشە تێگەیشتم" پاشان چووین لەسەر کورسی
دانیشتین و ئەوانیش دانیشتن، من دەستم پێ کرد و پێم کردە
کەوشی گەورەکانەوە، کاتێك سەیرم کرد کچەکەیان خاچێکی
کردووەتە ملی و کتێبی زەردەشت دەخوێنێتەوە! کوڕەکەیش لە
بەیانییەوە تا ئێوارە بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین خەریکە قسە بە
خوا، بە حکومەت، بە پێغەمبەر و بە دین دەڵێت! باوکیان
کەسێکی باوەرداری پابەندی لە سەدا سەد مەزهەبی بوو،
هەمیشە دەنگەدەنگی بوو لەگەڵ منداڵەکانیدا و پێی دەگوتن:

ئێوه به ڕێگەی خرپدا دەڕۆن، من منداڵی ناموسڵمان بەخێو ناکەم، لەم ماڵە بڕۆنە دەرەوە...، دایکە بێچارەکەیشیان لەم نێوەندەدا گیریخواردووه و ئەم هەموو خەم و خەفەتە لێی کردووە بە شێرپەنجە! باوکی خێزانەکەم بانگکرد، دوای ئەوەی قسەکانمان تەواو بوو، گوتم: کاکی فڵان؟ گوتی: بەڵێ، گوتم: تۆ خەریکی چی دەکەیت؟ گوتی: کاکە من موسڵمانێکم، خاوەنی بیروباوەڕم بەردەوام خەریکم بەرگریی لە بیروباوەڕی ئاینەکەم دەکەم، دەبێت فەرموودەی خوا و فەرموودەی کتێب پیادە بکرێت، گوتم: پێتوایە سەرکەوتوو بوویت؟ ئەوەتا ژنەکەت شێرپەنجەی گرتووە، وا خەریکە بەم زووانە دەمرێت ، چونکە لەگەڵ ئەم هەموو فشارانەدا هیوای باشبوونی نییە، کوڕەکەشت بووە بە دژی هەموو شتێك! کچەکەیشت هێندە سەرگەردانە، کچێکی موسڵمانە و خاچێکی کردووەتە ملی و دانیشتووە و خەریکە زەردەشت دەخوێنێتەوە! ڕێزمان هەیە بۆ هەموو ئاینەکان، بەڵام ئەمە دەریدەخات ئەم کچە زۆر شپرزەیە، بەڕاستی توانیوتە بەرگریی بکەیت؟! پێم گوت: کاکی فڵان، تۆ پێت وایە ئەگەر هەموو دانیشتوانی سەرگۆی زەوی بڵێن خودا بوونی نییە، ئایا خودا بوونی هەیە یان نییە؟ ئەم دینە کە خواوەند خۆی هێناوییەتی، خۆی پێغەمبەری ناردووە، خۆی ناتوانێت بەرگریی لە خۆی بکات؟! خۆی ناتوانێت بیباتە پێشەوە و تۆ بەرپرسیاریت؟ ئەویش بەم شێوەیەیە کە ڕێك پێچەوانە بووەتەوە! گوتی: باشە دەی دەبێت من چی بکەم؟ گوتم :خۆت ئەوە

به، که دەتەوێت پێیان ڕابگەیەنیت، ئەو پەیامە دروستانە

جێبەجێ بکە منداڵەکانت خۆیان دەیبینن، من دەیبینم،

ئەوانیتریش دەیبینن، بەرتیل مەدە، بەرتیل وەرمەگرە، گزی

مەکە، درۆ مەکە، فێڵ مەکە، میهرەبان بە، ڕێز لە جۆری مرۆڤ

بگرە، هەموو ئەمانە باشترین بانگەوازن! کەمێك بیریکردەوە،

گوتی کاکە زۆر سوپاست دەکەم، پاشان بەو کوڕەم گوت: کوڕی

باش، ئەگەر دەتەوێت شتێك ڕەت بکەیتەوە سەرەتا بیناسە، بۆ

نموونە من دەڵێم ئەم دینە خراپە یان ئەسڵەن دینێك بوونی نییە،

باشە، سەرەتا برۆ بیناسە، پاشان ڕەتی بکەرەوە. بەڵام خۆ تۆ

نەتناسیوە، خۆ تۆ لەسەر ڕق و کینە قسە دەکەیت، ئەو کەسەی

لەسەر ڕق و کینە قسە دەکات چاوی داخراوە، نابینایە، کاتێك

دەتوانیت کاریگەریت هەبیت کە ئەو شتە بناسیت و ئارام بیت،

ئارەزوی تێکدانت نەبێت، ئەمەی تۆ دەیکەیت تێکدانە، ئەمە

بیناکردن نییە! کوڕەکەش و کچەکەش ئارام بوونەوە.

سبەینێ بێ ئێوە ناخۆش چووینە کەناری ڕووبارێك و خانمەکان

خواردنیان دروست دەکرد، کاتێك نانمانخوارد بینیم ئەو پیاوە هات

بۆ لای من و گوتی: بەڕێز موعەزەمی؟ گوتم بەڵێ، گوتی: من

چوومە ئەو گۆشەیە لە تەنیشت ئەو ڕووبارەوە لەژێر ئەو درەختەدا

نوێژم کرد بە کەسیشم نەگوت، گوتم: خوا ئاگادارە تۆ ئەمڕۆ

گەورەترین بانگەوازت بۆ ئیسلام کرد، تۆ، پێت وایە کەس تۆی

نەدیوە، بەڵام زۆر کەس تۆی دیوە، ئەو خودایەش کە تۆی

خەلقکردووە، ئەمڕۆ لە تۆ خۆشحاڵترە، کاتێك دەبینیت ئازاری بەندەکانی نادەیت.

حەزرەتی موسا و شوانەکە بەیاد بهێنەرەوە، هەرکەسە و بەجۆرێك پەیوەندی دەبەستێت، نابێت هەمووان بەجۆرێك پەیوەندی ببەستن و بەجۆرێکیش قسە بکەن، ئافەرین بۆ تۆ پیاوی تێگەیشتوو.

خۆشبەختانە ئەو خێزانە ڕزگاریان بوو، ئێستا ئەو خانمە شێرپەنجەکەی بەرەوچاکبوونەوە دەچێت، ژیانی ئەو خێزانە گەرمی تێکەوتەوە و کوڕ و کچەکەیش گەڕانەوە.

ئەگەر دەتەوێت بانگەواز بکەیت بەکردار بیکە، هەرچییەك فێربوویت کرداری پێ بکە.

ئێمە زۆربەی جار بۆ ئازادی نا جەنگین، بۆ دیلکردنی ئەوانیتر دەجەنگین، لەمەودوا کاتێك خەریکی کات بە فیڕۆ دەدەیت و مشتومڕ دەکەیت، لە خۆت بپرسە بۆچی خەریکم ئەمکارانە دەکەم؟ زۆرێك لەوشتانەی دەتەوێت بیان بڵێیت بە بوونی خۆت دەتوانیت بیانڵێیت، دەتوانیت پێشنیاز بکەیت، دەتوانیت بانگهێشت بکەیت، دەتوانیت هەواڵ بگەیەنیت، بۆ نموونە بڵێیت سیمینارێك هەیە، مادام خۆت دەچیت و باوەڕت بە سیمینار هەیە، بەڵام هیچ کات خێزانەکەت ناچارمەکە کە بە زۆر بچن بۆ ئەو سیمینارە... ئافەرین چێژی لێ وەربگرە، ئەمە ناکاتە ئەوەی یەخەی دووکەسی تر بگریت و بڵێیت وەرن لەم سیمینارەدا

بەشداریی بکەن، نا، بە ئارامی نیشانی بدە ئەوەی فێری بوویت
چییە، خەڵکی خۆیان پرسیارت لێ دەکەن.

ژیانی باش بەڕای ئێوە چ ژیانیکە؟ ژیانێک کە تێی دا ئاسوودە
ببیت؟ من ئەم پرسیارەم لە زۆر کەس کردووە، زۆربەیان
وەڵامەکانیان بەم جۆرە بووە: (ژیانێکی ئارام، بێ خەم و خەفەت،)
کلیلی ژیانی باش لە زەیهنی مرۆڤدا ئەوەیە بێ کێشە و بێ
سەرئێشە بێت، زۆر باشە، دەتانەوێت ڕێگەیەکی باشتان نیشان
بدەم هەر ئێستا بە ئارامی و ئاسوودەیی تەواو بگەن؟ "بڕۆن بۆ
گۆڕستان چاڵێك هەڵبکەنن و بڕۆنە ناوی!" (هەموو ژیان ئەوەیە
کە بەبێدەنگی نەمرین). ئەوکەسەی بەدوای ئارامیدا دەگەڕێت،
هەموو ڕۆژێك خۆی بچووکتر دەکاتەوە! ئەگەر بازنەیەکی ئارامی
بە چواردەوری خۆتا بکێشیت، هەموو ڕۆژێك فشارەکانی دەرەوە
زیاتر دەبێت، بەردەوام فشار دێت، تۆ چی دەکەیت؟ بەردەوام
بچووکتر دەبیتەوە! لەبەرئەوەی دەتەوێت بە ئارامی بگەیت،
دەتەوێت لەو بازنە نەچیتە دەرەوە! هەرکەس بەدوای ئارامیدا
بگەڕێت بە مەرگ دەگات. لە کاتێکدا تۆ بۆ مەرگ بەدی
نەهێنراویت، تۆ بۆ ژیان بەدیهێنراویت. لەو بازنەی ئارامییەت
وەرە دەرەوە، فشارەکان پێچەوانە دەبنەوە، هەرکاتێك بینیت
فشارت زۆرە لەسەرە، بزانە بەدوای ئارامیدا دەگەڕێیت. هەرکەس
بەشوێن ڕێگا ئاسانەکاندا دەڕوات، ژیانی ڕۆژ بە ڕۆژ سەختتر

دەبێت، هەرکەسێکیش پێشوازی لە سەختی و گۆڕانکارییەکان دەکات، هەموو ڕۆژێك ژیانی ئاسوودەتر دەبێت.

ئەگەر بابەگەورە و دایەگەورەی ئێمە بەو جۆرەی ئێمە دەمانەوێت بەشوێن ئارامیدا گەڕابان، ئێمە ئێستا لە ئەشکەوتەکاند بووین، نەوەك بچین بۆ سەر مەریخ! هەموو ئەم پێشکەوتنە زانستیانە سەرەتای ڕێگەکەن، تازە جیناتی مرۆڤیان ناسیووە! دەبێت چەندین نەخۆشی لەنێو ببەن، چەندین ڕێگەی تازە بدۆزنەوە، هەموو ئەمانەیش من و تۆی ئینسان دەیاندۆزینەوە، هۆکارەکەیشی لەبەرئەوەیە کە ئارام ناگرین. (ئێمە شەپۆلێکین ئاسوودەبوونمان نەمانمانە، ئێمە بەوە زیندووین کە ئارام نەگرین!)

ئەگەر ئارام بگریت لەنێو دەچیت، شەپۆل واتە نائارامیی، پەرێشانیی، جووڵان، خرۆشان، وروژان. من ئارامبم؟ یانی چی من ئارامبم؟! ئەگەر لە شووین ئارامی بگەڕێیت، چەق دەبەستیت، لەنێو دەچیت! بەشوێن ئارامیدا مەگەرێ، هەموو ڕۆژێك بەدوای شتێکی تازەدا بگەڕێ، شتێکی تازە فێر ببە، گۆڕانکارییەك لە ناخی خۆتدا ئەنجام بدە، هاوکاریی بکە ئەوانیتریش ژیانیان بگۆڕێت، هاوکاریی بکە دنیا ببێتە جێگەیەکی باشتر، لە کۆڵانەکەتان درەختێك بڕوێنە، ئاوی بدە، باخچەکەتان بژار بکە، جۆگەی ئاوەکە خاوێن بکەرەوە، گۆڕانکارییەك بکە، ئەوەی لە دەستت دێت بیکە، ماتڵی کەس مەبە. ئەوکاتەیە کە ئیدی

نائارامی ژیری دەبێت، ئەوکاتەیە کە دەزانیت نائارامی شەپۆلێکە، ئەوکاتەیە کە هەست دەکەیت تۆ بەهات هەیە.

بۆچی لە گوندی خۆیدا ماوینەتەوە و نایەینە دەرەوە؟!

دیوارەکانی چین؟ ترس! ترس لە گۆڕان، ترس لە دۆڕان، ترس لە قسەی خەڵکی، ترس لە هەژاریی... هتد، زۆرێك هەن دەڵێن پارەمان دەوێت، بەڵام باوەڕتان هەبێت کاتێك کەمێك دەیدوێنیت، دەبینیت هەر قسەیە، ئامادە نییە نرخەکەی بدات، ئامادە نییە بگۆڕێت! زۆربەی خەڵکی دەڵێن من ناگۆڕێم تا دنیا نەگۆڕێت، مەحاڵە شتی وا، تەنیا شتێك کە لەم دونیایەدا ناگۆڕێت، خودی گۆڕانە! هیچ ڕۆژێك نییە کە لە دوێنێ بچێت، هەر ڕۆژێك کە خۆر هەڵدێت و ئێمە پێمان وایە هەر ئەو خۆرەیە، هەندێك لە تەنەکانی کەم بوونەتەوە، بوون بە پلەی گەرمی. چەند ملیارد ساڵی تر خۆر لەنێودەچێت، ساردەبێتەوە، ئەم خۆرە ئیتر خۆرەکەی دوێنێ نییە. ئەو ئاوەی لە ڕووبارێکدا دەیبینیت ئاوی چەند چرکە لەوەوپێش نییە، تێ دەپەڕێت، هەموو ساتێك تازە دەبێتەوە، تۆیش هەموو چرکەساتێك تازە دەبیتەوە، ئەمەش ئەرزشە، دژی بەهاکان نەجوڵێین، با جێگیر و ڕاوەستاو نەبین.

جارێکیان باوکێك لە ڤانکۆڤەر پێی گوتم: بەڕێز موعەزەمی، ئەم کوڕەم ژیانی لێ تاڵ کردووین، گوتم بۆچی؟ گوتی: سنگ دەرەپەڕێنێت، خۆی فش دەکاتەوە، هیچم بەگوێ ناکات، باڵ ڕادەوەشێنێت، پۆزم بەسەردا لێ دەدات، قسە بە دایکی دەڵێت،

تەواو بێتاقەتی کردووین، ڕێوشوێن بۆ من دادەنێت... گوتم دەی قەیچێکا، گوتی قەیچێکا؟! گوتی: کاکە سیستەمی ژیانمانی تێك داوە! خۆی لە نیشی خوشکەکەی هەڵدەقورتێنێت، لە نیشی دایکی، ڕێگەمان بۆ دادەنێت، هەر ڕۆژەی بە ئاوازێك هەڵدەپەڕێت! گوتم باشە من ئێستا شتێکت بۆدەکەم، گوتی چی دەکەیت؟ گوتم خوایە گیان کوڕی ئەم پیاوە زەلیل بکە، گۆج و ئیفلیجی بکە، جەڵدەی مێشك لێی بدات و لەسەر جێگە بکەوێت.. گوتی" ئەی هاوار.. جەنابی موعەزەمی ئەوە تۆ چی دەڵێیت؟ گوتم مەگەر تۆ ئەمەت ناوێت؟ تۆ ئەمەت دەوێت، تۆ دەتەوێت کوڕەکەت وەکوو منداڵی ساوا لە ناو بێشکەدا بێنێتەوە، منداڵەکەت گەورەبووە و گۆڕاوە، تۆ دەبێت کاتێك منداڵەکەت، کوڕەکەت، هاتە بەردەمت گوتی: (من) بڵێ کوڕەکەم ڕاوەستە، بڕۆ بەر ئاوێنە و ماچی خۆت بکە و بەساقە و بە قوربانی خۆت بە، بڵێ سەرکەوتوو بووم، ئینجا بڵێ چییە کوڕی خۆم؟ چونکە تۆ لەوەدا سەرکەوتوو بوویت منداڵەکەت بگەیەنیت بە قۆناغێك کە خۆی بناسێت و من من بکات. بۆچی دەتەوێت بچووکی بکەیتەوە؟ بۆچی دەتەوێت سەرکوتی بکەیت؟

هەموو میللەتێك بەدرێژایی ژیانی تەنیا یەك دەرفەتی هەیە بۆ ئەوەی کە بازێك بدات و ئەم دیواری ترسە بشکێنێت، ئەویش تەمەنی پێگەیشتنی گەنجەکانییەتی، ئەم گەنجە هاتووە دەیەوێت گۆڕانکاریی بکات، دەیەوێت لە کۆت و بەندەکانی گوندی خۆیی

من بیتە دەرەوە، من هەموو هێز و توانا و دەسەڵاتی خۆم بەکار بهێنم و سەرکوتی بکەن بۆ ئەوەی پێی بڵێم لە گوندی خوێی باوکتا بێنەرەوە؟! ئەمە شەرم هێنەرە و دژی دەسەڵاتی خوایە!

با منداڵەکانمان هانبدەین، هەر کاتێك منداڵەکانمان هەستی خۆیان دەربڕی بڕۆنە بەردەم ئاوێنە و خۆتان ماچ بکەن، چونکە شیرت پێداوە، کوتاوتە، گۆڕیوتە، دەرمانت پێداوە، پەروەردەت کردووە، هەزار جۆر ئیشتکردووە تا گەیشتووەتە ئەم تەمەنە، سوپاسی خوا بکە. ئینجا گوێی لێبگرە بزانە بیروڕاکانی چین؟ بەڕێزان خوشکان و برایان، من دەمەوێت تکایەکتان لێبکەم، ئەم ڕاهێنانە سادە ئەنجامبدەن: قەڵەم و کاغەزێك هەڵگرن و سەیری چواردەوری خۆتان بکەن و پرسیار لە خۆتان بکەن، ئەو کەسانەی لە چواردەوری منن چ شتێك لە من زیاتر دەزانن؟ چ کارێك لە من باشتر ئەنجام دەدەن؟ لیستێك ئامادە بکەن، هەر کاتێك کە پێتوابوو من دەبێت لە هەموو کەس باشتر و سەرکەوتوو تر بم، ئەوە بزانە تۆ ڕێك لە ناوەڕاستی چاڵی خوێدایت، نەك گوندی خوێ!

ئەمکارانە ئەنجام بدەن لە منداڵەکانی خۆتانەوە دەست پێ بکەن، من کچێکم هەیە تەمەنی دوو ساڵ و پێنج مانگە، ناوی (شادی)یە، باوەڕ بکەن، من ئەم پرسیارە لە خۆم دەکەم، گوتم ئێستا ئەم شادی خانمە چی هەیە بۆ ئێمە؟ سەیرم کرد ئەم منداڵە بچووکە ڕۆحی ماڵەکەمانی گۆڕیوە، خەریکە فێری ئەوەم دەکات

هەر لە خۆتەوە پێ بکەنە، شاد بە، بە شووێن بیانودا مەگەڕێ بۆ شادی، منداڵ لە هەرماڵێکدا بێت، خۆی شادییە، دوو سەعات بە شتێکەوە خۆی سەرقاڵ دەکات... بەڵێ هەر ئەمەیە ژیان! ئەم کتێب و سیمینارانەی پێشکەشی ئێوەی دەکەم، لە شادییەوە فێریان بووم، هەڵدەسێت دەست بەدیوارەکەوە دەگرێت، کەمێك دەڕوات و دەکەوێت بەزەویدا، دەڵێم ئێستا واز دەهێنێت، دیسان هەڵدەسێتەوە و زرم دەکەوێتەوە سەر زەوی، دیسان هەڵدەسێتەوە، بۆ ئەوەی نەکەوێت ڕا دەکات، ئەمجار خراپتر دەکەوێت، دیسان هەڵدەسێتەوە!

منی فێرکرد گوتی جەنابی موعەزەمی هەستە شتێك بکە، ئەوەی دەیزانی فێری ئەوانیتری بکە، هەم پارە پەیدا دەکەیت، هەم خەڵکی خۆشحاڵ دەبن، هەم هاوڕێی تازە پەیدا دەکەیت، هەم گۆڕانکاری دەکەیت، دەکەویتە سەر زەوی، دەی هەستەرەوە. سەیر لەوەدایە هەر وا بووە. من جاران پێم وابوو، ڕەنگە زۆر کەس ڕازی نەبن و نەهێڵن لە ئێراندا سیمینار بکەم، بەڵام ئەسڵەن وانییە، بە پێچەوانەوە زۆریش یارمەتیم دەدەن، مەحاڵە من بتوانم سیمینار پێشکەش بکەم بێئەوەی مۆڵەتم هەبێت، من لە هیچ شوێنێك بەنووسراوی فەرمی داوای مۆڵەتم نەکردووە، بەڵام مۆڵەتیانداوم، ئەوەتا پێشکەش دەکرێت، سوپاس بۆ خوا. ئێوەش مەترسن بڕیاری پێشوەختە مەدەن، قسە بکەن، ڕای خۆتان دەربڕن، بەڵام بە عەشق و ئەنگیزەی بنیادنانەوە.

منداڵێکی بچووك ئەگەر بتەوێت گوێی ڕابکێشیت، جلەکانی لەبەرداکەنی، بووکەڵەکەی لێبستێنیت، دەقیژێنێت، ئەمە هەر وایە! بە عەشق و پاڵنەری بونیادنانەوە داهێنان بکەن، تێکی مەدەن، گوێ لەو هەواڵانە مەگرن کە دەروونتان دەشێوێنن یان مەیلی تێکدانتتان تیا بەدی دەهێنن، ئەمانە هیچ سوودێکی بۆ هیچ کەسێك نییە، یان لە نیازپاکییەوە دەیلێن یان لە نیازخراپییەوە، بەهەرحاڵ بەکەڵك نایەن، بونیاد بنێ، شتێك بونیاد بنێ، کەسێك ڕزگار بکە، شتێك بەباشی بگۆڕە، ئەوەی بونیادنراوە تێکی مەدە، کەسێکی گەمژەش دەتوانێت بینایەك خراپ بکات، بەڵام دەبێت چل ئەندازیار و هەزار کرێکار بێت تا بونیادی بنێنەوە، بونیادنان کاری ئینسانی تەندروست و بونیادنەرە، بونیاد بنێن، مەترسن. کاکی بەڕێز هاوسەرەکەت ئیتر ئەو کەسە نییە کە دەزگیرانت بوو، گۆڕاوە، کاتێك منداڵتان بوو، بزانە دووگیانی و منداڵبوون دیاردەیەکە، مەڵێ من زەواجم کردووە و ژنەکەم دووگیان بووە و هەموو ڕۆژێك دەچێت بۆلای دکتۆر، هێڵنج دەدات، دەڕشێتەوە...، دەی باشە مەگەر تۆ ناتەوێت ببی بە باوك؟ مەگەر ئەمەت ناوێت؟ ئەم ژنە ئیتر ناتوانێت ئیشەکانی جارانی بکات، ئەمە ئاگاداری و کات و گرنگی پێدانی دەوێت، دەبێت قسەی لەگەڵدا بکەیت، پێی بڵێیت: منداڵەکە چۆنە؟ تۆ حاڵت چۆنە؟ ئەوەندە عەشقی پێ ببەخشیت تا ئەو عەشقە بدات بە کۆرپەکەی و بەسەلامەت بێتە دەرەوە،

ژنەکە من ئیشم هەیە، ئیشم هەیە! تۆ ئیشی چیت هەیە؟ یانی نازانیت کە بوونی منداڵ کات و تێچوونی دەوێت؟ کاکە پشتی شکاندوین، پارەمان پێنەما، هەموویمان تیا سەرف کرد! کاکی بەڕێز: تەمەنت چل ساڵە، خانمی بەڕێز تەمەنت سی ساڵە، گۆڕانت بەسەرا دێت، پێکهاتەی کیمیاییت دەگۆڕێت، توانای جارانت نامینێت، دەبێت ئەمانە قبوڵ بکەیت، ئەمانە ڕوو دەدەن، پێشبینیان بکە، ئامادەبە بۆیان، ئەگەر ئامادە نەبیت ناچاری حەسرەت بخۆیت!

بێگومان پێتاخۆشە چیرۆکێکتان بۆ بگێڕمە لەبری ئەم ئامۆژگارییانە:

من کچێکم هەیە تەمەنی بیست و چوار ساڵە، ڕۆژێك دایکی ئیشی هەبوو، هەینی بوو، من کچەکەم هەڵگرتوو چووم بۆ کۆمپانیا، سەیارەیەکی بی ئێمم هەبوو دوو کابرێتەر بوو، فیتەرەکان هیچیان نەیاندەتوانی چاکی بکەنەوە، تەنیا دەیانتوانی پارە وەربگرن، من کتێبەکەیم کڕی و دانیشتم خووێندمەوە گوتم بزانم ئەمە چۆن ئیش دەکات؟ پاشان ئامێرێکم دەویست چووم گوتم ئێوە ئەم ئامێرەتان هەیە؟ گوتیان: بەڵێ هەمانە بەڵام نازانیین بۆچی باشە، گوتم: بمدەنێ با ماوەیەك لام بێت دوایی کە هێنامەوە پێتان دەڵێم چۆن ئیش دەکات، گوتیان باشە، ڕۆژی هەینی بردم بۆ کۆمپانیاکەم و کابرێتەری سەیارەکەم ئەوەندە ئاڵۆز بوو دنیایەك برغوو و سەموونە و واشێری لەگەڵدا بوو، ئەگەر

یەکدانەیان ونبوایە سەیارەکەم ئیشی نەدەکرد، هەموویانم کردەوە،
لەکاتی کردنەوەی برغووکاندا دەستم هەمووی ڕۆناوی بوو،
کچەکەم گوتی باوکە باوکە، گوتم: بەلێ، گوتی: برسیمە،
سەیرێکی دەستەکانم کرد و گوتم: ئێستا دێم، شتەکانم دانا و
دەسەکانم پاککردەوە و چووم بسکیتێکم بۆ هێنا، هەروا کە
خەریك بوو بسکیتەکەی دەخوارد دیسان سەرقاڵ بوومەوە و دەستم
چەور بووەوە و گوتی: بابە بابە بابە، گوتم ئیتر چیت دەوێت؟ گوتی
تینوومە، ئەی خوایە هاوار! شتەکانم دانایەوە، وریابووم ئەمانە
وننەبن، دەستم پاککردەوە و چووم جامێك ئاوم بۆ هێنا گوتم: بابە
هیچی ترت ناوێت؟ گوتی چم، چم، نا.. چووم دانیشتمەوە
ئیشەکەم گەشتبووە ئەوپەڕیی، هەموو پارچەکانم لێکردبووەوە و
چاوەڕێی کۆکردنەوەیان بووم، گوتی: بابە بابە بابە دەچم بۆ
تەوالێت! من لە ناکاو توڕە بووم گوتم: یان ئاوت دەوێت، یان
برسیتە، یان دەچیت بۆ تەوالێت.. ئاخر من چی بکەم؟! گوتی:
جارێ ببە بۆ تەوالێت، سەیر ئەوە بوو ڕاستی دەکرد ئەگەر
نەمبردایە هەموو شتێکی پیس دەبوو، دەبوو دایبی و جلەکانیشی
بگۆڕم، ئەوم داناو ڕۆشتم، پاشان لەبەر خۆمەوە گوتم باشە: من
بۆچی توڕە دەبم؟ هۆکارەکەی ئەمەیە: چونکە من پێم وایە لەبەر
ئەوەی من سەرقاڵی چاککردنەوەی سەیارەکەمم و هەموو هۆش و
بیرم لای ئەوە، ئیتر ئەم منداڵە نابێت داوای هیچ بکات! کاتێك
منداڵێك لەگەڵ خۆت دەبەیت، دەبێت کاتی بۆ دابین بکەیت.

بوونه خاوەنی منداڵ کاتی دەوێت، دەبێت زۆرترین کاتی بۆ دابین بکەیت، هەموو شەوێك چیرۆکی بۆ بگێڕیتەوە.

هەر ئەم کچەمان من شەوانە چیرۆکم بۆ دەگێڕایەوە، ڕۆژێکیان هات من زۆر ماندووبووم، خەوم لێکەوتبوو، بەشتێك منی خەبەرکردەوە، زۆر نارەحەتبووم، ئەسڵەن گوێی پێنەدا من وا بەقوڵی خەوتبووم، گوتم: ها چییە؟ گوتی: بۆچی وڕێنە دەکەیت؟! گوتم: کچم بە خوا زۆرم خەو دێت وازم لێ بێنە با بخەوم.

منداڵ بەخێوکردن کاتی دەوێت، منداڵت هەیە کاتی دەوێت، هاوسەرت هەیە کاتی دەوێت، کۆمپانیات هەیە کاتی دەوێت، هاوڵاتیبوون کاتی دەوێت. ئەو دەگۆڕێت، ئێمەش لەگەڵیدا ڕانەهاتووین، بۆچی هاوسەرەکەم ئەوەندە دەڵێت بابچین بۆ فڵان و فیسار شوێن؟ با ئەم دەعوەت بکەین با ئەو دەعوەت بکەین... دەی دیارە ئیتر زەواجتکردووە، ئیتر بە زوگورد نیت.

هاوڕێیانی خۆشەویست ئەگەر پێشبینی ئەم گۆڕانکارییانە بکەین و کات و بودجەی پێویستیان بۆ دابین بکەین، ئەوکات دەبینین ژیان چەندە ئاسان دەبێت! چ گۆڕانکارییەك چاوڕێی ئێوە دەکات؟ دەتەوێت بچیت بۆ زانکۆ، خانەنشین دەبیت، بۆ نموونە: دەبیت بە دایك، دەبیت بە باوك، دەتەوێت پیشەکەت بگۆڕیت، کۆچ بکەیت، لە شارێك بڕۆیت، هەرشتێك... هەموو ئەمانە بنووسن، کەی ڕوو دەدەن؟ دوو ساڵی تر؟ سێ ساڵی تر؟ پێنج ساڵی تر؟ تەواوی ئەو کەسانەی خانەنشین دەبن ئەگەر پێشوەختە

ئامادەییان تیابێت تەمەنیان درێژە، ئەگەرنا تەمەنیان کورت دەبێت، بەتایبەتی ئەوانەی پیشەی زۆر گرنگیان هەبووە، بۆنموونە: ژەنەراڵێك بووە سوپایەك لە ژێر دەستیدا بووە، ئێستا ژنەکەی خۆیشی بەگوێی ناکات، جەڵدە لێی دەدات، لە ماوەی یەك بۆ سێ ساڵدا دەمرێت، حەتمەن پێشبینی بکەن، گۆڕانەکان لەبەردەمتان، ئەگەر پێشبینیان بکەیت زاڵ دەبیت بە سەریاندا، ئەگەر پێشبینیان نەکەیت زاڵ دەبن بەسەرتا، وا باشترە ئێوە زاڵ بن بەسەریدا، هەروەها پرسیار لە خۆتان بکەن بڵێین چی بکەین زاڵ بین بەسەر ترسەکانماندا؟ من دەمەوێت تکاتان لێ بکەم کە لەم باسەماندا تەواوی وزە و تواناتان لەبەشی دووەمدا بەکار بهێنن، بەڵام بەرلەوە، ئەوە بزانن تەواوی ئەم دۆزینەوانە لە ژیانی مرۆڤدا دۆزراونەتەوە واتە کەسانێك هەن کە جیاواز ژیاون، ئەمەش دەکرێت و من و تۆیش دەتوانیین ئەنجامی بدەین هەنگاویشمان بۆ ناوە و بەڵگەش ئەوەیە کە ئەم باتە ڕاڤە دەکەین.

زۆر باشە، دەبێت چی بکەین؟ بەڵام بەر لەوەی شتێك بکەین دەبێت وەڵامی پرسیارێك بدەینەوە، زۆربەی ئێمەی مرۆڤەکان لە ئایندە دەترسین، ترسمان هەیە، بۆچی ترسمان هەیە؟ نایناسین، نادیارە، کێ دەڵێت تۆ ئێستا لەباشترین بارودۆخدایت؟ دەتەوێت بڵێیت نا من جارێ ئێرە بەجێناهێڵم تا دڵنیا نەبم، لە سیمینارێکدا خانمێك پێی گوتم: جەنابی موعەزەمی هەموو قسەکانت باشن، بەڵام لەوێدا کە دەڵێیت ماسی دەبێت لە

حەوزەکەی باز بداتە دەرەوە، هەستمکرد تەنافێك لە ملمدایە و خەریکە دەخنکێم. گوتم: دەی هەروایە، منیش هەر ئەمە دەڵێم، هەمووی خەیاڵاتە، تەنافێك لە ملتا نییە، وا بیردەکەیتەوە، چونکە خەیاڵ و بیرت لای ترسە، ترسەکە بە سەرتا دێت و هەست بە خنکان دەکەیت! ترسێك لە ئارادا نییە، هەمووی ئێمە بەدی دەهێنین، هەرگیز بەتەمای ئەوە نەبن لە سەداسەد ئاگاداری ئایندەی خۆتان بن. هەرگیز چاوەڕێی ئەوە مەکەن تا سەرکەوتوو بن، دەڵێیت ئاخر دەترسم، من ناڵێم مەترسە، دەڵێم بترسە و هەنگاو بنێ! ئەگەر نەترسیت خۆ هیچت نەکردووە! ئەو کەسەی نەترسێت هونەری نەکردووە، خەریکە کاری ئاسایی خۆی ئەنجام دەدات، کاری گرنگ ئەوەیە لە ئەنجامەکەی دڵنیانیت، گرنتیشیان پێنەداویت بەڵام خەریکیت ئەنجامی دەدەیت، ئەمە ناوی ئازایەتییە، ئازایەتی ئەوەیە کە بترسیت و ئەنجامی بدەیت، نەوەك نەترسیت!

دایك و باوکێك کە لە خۆشەویستانی منن، کاتی خۆی ڕۆژێك باوکەکە هات و بە منی گوت: مەحمود گیان؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: کوڕێکم هەیە ئامادەم یەك ملیۆن تمەن بدەم بە مەرجێك ئەم کوڕەم چاك ببێت...، کەمێك بیرم کردەوە و گوتم: دەبێت ئەم منداڵە چی بێت؟ گوتم: چییەتی؟ گوتی: نازانم بە جۆرێکی لێهاتووە، گوتم: بەڕاستی تۆ ئامادەیت یەك ملیۆن تمەن خەرج بکەیت بۆ ئەم منداڵە؟ گوتی: بەڵێ ئامادەم، من ئەو کاتە وەك

ئێستا زۆر بە ئەدەب نەبووم، گوتم: من پێشنیازێکت بۆ دەکەم، گوتی چییە؟ گوتم: نزیکەی دووسەد تا سێسەد هەزاری لە خۆت و لە دایکیدا خەرج بکە، ئەوسا هەمووان خۆشحاڵ دەبن! هەم خۆت، هەم منداڵەکەت، هەم هاوسەرەکەت، هەم چواردەورەکەت! قسەیەکی جوانم نەکرد، بێ ئەدەبانە بوو.

بەڵام ئێمە بۆ ئەوەی نەگۆڕێین پارە دەدەین، پارە دەدەین تا یەکێکی تر بگۆڕێت، بەڵام من نەگۆڕێم! ئەم منداڵە بەرهەمی پەروەردە و ڕەفتاری منە، ئەگەر لە ڕۆژنامەیەکدا نووسرا کوڕێك یان کچێك کارێکی ناشیرین یان تاوانێکی کرد، ئەمە بەرهەمی من و تۆیە کە گەورەترین! چونکە ئەو منداڵە، ئەو گەنجە.

ئەگەر کەسێکی شێت هات و لە شەقامێکدا کەسێکی کوشت، بەرپرسیار نییە، بەرپرسیار کەسێکە کە عەقڵی هەیە، ئێمە پارە دەدەین، شەڕ دەکەین بۆ ئەوەی نەگۆڕێین، تکا دەکەم پارە و کاتی خۆتان بە هەدەر مەدەن چونکە گۆڕان شتێکی ئارام و دڵنیا و ڕانەوەستاوە! گوێ لە قسەکانی بگرە ئەگینا لەژێر تایەکانیدا دەپلیشێیتەوە، گۆڕان ڕاناوەستێت ئێمە دەپلیشێینەوە و لە نێو دەچین، دایناسۆرەکان نەیانتوانی خۆیان بگونجێنن لەگەڵ سروشت لەنێو چوون، هەر جۆرێکی تر بگری هەروایە، نەتوانێت بەردوام بێت و خۆی بگونجێنێت لە نێو دەچێت، هونەری من و تۆ ئەوەیە هەلومەرجەکان قبوڵ بکەین، خۆمان ڕابهێنین، فێر ببین،

ئەگەر سەرماتە بلەرزێ، ئەگەر گەرماتە عارەقە بکەرەوە، ئەمە بەرگریی جەستەتە.

ئێمە لە زمانی فارسیدا شیعرێکی جوانمان هەیە دەڵێت: (هەتا پەرێشان نەبیت کارت جێبەجێ نابێت.) پەرێشانی یانی چی؟ یانی شپرزەبوون، وێرانبوون، دەبێت چی خراپ ببێت تا جێبەجێ بێت؟ ئەو شتەی کە تیایدا هەست بە دڵنیابوون دەکەیت، دەبێت بڕوخێت، تاوەکوو ڕێگە بکرێتەوە و بگەیت بە بارودۆخێکی تازەتر و باشتر. هەمیشە پێشوازی لە پەرێشانی بکە، ئەم پەرێشانییە لە ڕاستیدا، واتە ئەوەی کە ئێمە دڵنیاییمان نییە، پەرێشانی ئێمە ئەوەیە کە وا دەزانین پێگەمان لە دەست دەدەین، دەی دەبێت لە دەستی بدەین، بینیوتانە هەندێك لەو کەسانەی پیر دەبن دەڵێن: ئای گەنجێتی لە کوێیت، یادت بەخێر! من دەڵێم: ئەگەر ئەم قسەیە دەکەیت خەریکی ناشوکری دەکەیت، پیریی واتە: تۆ سەرکەوتوو بوویت و بەناو ساڵەکاندا تێپەڕیت پیر ببیت، پیریی سەرکەوتنێکە، سەرکەوتوو بوویت لە تێپەڕاندنی ئەمانەدا: نەخۆشی، بومەلەرزە، جەنگ، ڕووداوەکان، هەموویانت تێپەڕاندووە...، کەواتە خۆشحاڵ بە، ئەو کەسەی حەسرەتی گەنجێتی دەخوات، بە ئەگەری زۆر دەبوو جوانەمەرگ بوایە، تا ئیتر حەسرەت نەخوات، واتە بزانن من کە ئێستا گەنجم ڕۆژێك پیر دەبم، من کە ڕۆژێك پیر دەبم، تەمەنم تەواو دەبێت، یەکێك لە گۆڕانە مەزنەکانی ژیانی ئێمە مەرگە، حەتمەن بیر لە مەرگ

بکەنەوە، باش بیری لێ بکەنەوە، کاتێك باش بیرت لێ کردەوە، زۆر ڕێز لە ژیان دەگریت، ئیتر دەژیت! من ئێستا ئاوام، من چەندین ساڵە دەڵێم شتێکە دێتە پێش، شتێکە ئەسڵەن سەرسوڕمانی ناوێت، تازە ئەگەر شانسم هەبێت، مەرگی ئازیزانم نابینم، ڕووداوێکە و ڕوو دەدات. بەڵام ئەوە بزانە دەبێت ڕێز لە ژیانت بگریت.

بۆچی مەرگ سەختە؟ بۆچی مەرگ بە ئازارە؟ چونکە گۆڕانە، لە حاڵەتێکەوە دەچیت بۆ حاڵەتیکی دیکە، هەیت و نامێنیت! دەچیتە بارودۆخێکی تازەوە، دەچیتە دنیایەکەوە کە نازانی چیت بەسەر دێت! چونکە نەتدیوە و ئەزموونت نەکردووە بەلاتەوە سەختە، گۆڕانی بارودۆخەکە سەختە، ئەگەر تۆ ئەمە وەك بەشێك لە ژیانت وەربگریت ئەوکات تۆ لەبری ئەوەی خەفەتی لێ بخۆیت، لەبری ئەوەی بە خەیاڵ و داڵغەوە بیری لێ بکەیتەوە، دەڕۆیت بەلای ژیانتەوە تا بەهای ئەو دەرفەتە بزانیت کە پێت دراوە، لە هاوڕێکانت، لە خۆشەویستەکانت، لە ئەو بەهرانەی کە پێت بەخشراوە چێژ وەربگریت، تا ئیتر بۆڵە بۆڵ نەکەیت، ڕەخنەی بێهودە نەگریت.

گەورەترین بەربەستی گەشە و بەرەوپێشەوەچوونی هەر مرۆڤێك، هەر کۆمەڵگایەك، ترسەکانیانە، ترس لە لەدەستدان... ئاخر ئێمە ئێرانین، فلانین... ئاخر ئازیزی من تۆ هاتوویت لە کەنەدا کچەکەت بەسەیارە دەبەیت بۆ قوتابخانە، لە بەردەم

قوتابخانەکەی ڕادەوەستیت و دوایی دەیبەیتەوە بۆ ماڵەوە، ئاخر ئەمە چ کارێکە تۆ دەیکەیت؟! ئەم کچە لای هاوپۆلەکانی تەریق دەبێتەوە، بچووك دەبێتەوە، دەڵێت کاکە من چی بکەم کچە و گەنجە و... هتد، گوتم: تۆ کاتێك لە ئێران ئەمکارەت دەکرد باوبوو، هیچ منداڵێك تەریق نا بێتەوە، ڕەنگە زۆریش باش بێت ئیتر من نازانم چاکە یان خراپە، تۆ چەمکی ئەمە بهێنە بۆ ئێرە ئەوەك کردەوەکە، کردارەکە دەهێنیت لێرە بە کەڵك نایەت، لە هەموو شوێنێکی دنیا مرۆڤ دەبێت ڕێز لە خێزانەکەی بگرێت، خاوەنی هەر باوەڕێکیت دەبێت ڕێز لە هاوسەرەکەت بگریت، ئاگات لە ماڵ و منداڵ و خێزانەکەت بیت، ئەمە زۆر ئاساییە، بەڵام ڕەفتارەکان جیاوازیان هەیە، تۆ ئەگەر لە ئەمریکا، کەنەدا، یان هەر وڵاتیکی دیکە کە ئاینیان جیاوازی هەیە منداڵ تا بەردەمی قوتابخانە ببەیت و ڕاوەستیت تا تەواو دەبێت، هەموان گاڵتەی پێ دەکەن، بەتایبەتی لە تەمەنی باڵقیدا، تۆ دەتەوێت باش پەروەردە ببێت و خراپ دەرنەچێت، ڕێگەکەی بدۆزەرەوە، کێشەی گەورەی ئێمە لە پەیام و فەرموودەکانی خوای گەورەدا نییە، لە تێگەیشتنی ئێمەدایە، ئێمە خەیاڵی خۆمان و توێکڵی دین وەردەگرین، ئەوەك ناوکەکەی! بۆ نموونە: پارەت لای فڵان کەسە، بەپێی یاسا تۆ لەسەرحەقیت، بەڵام دەزانیت کە ئەو کەسە ناتوانێت پارەکەت بداتەوە، لەگەڵیدا بسازێ.

یاسا بە تۆ دەڵێت تۆ لەسەر حەقیت، بەڵام لە کێشەیەکدا خۆیشت دەزانیت لەسەر حەق نیت، حەتمەن بڕۆ ئەو داوایە بکێشەرەوە، چونکە یاسا چەند هێڵێك و گەوهەری هەیە، ئێمە دەبێت ڕۆحی یاسا پیادە بکەین، ڕۆحی یاسا دادپەروەرییە، میهرەبانییە، گەورەییە و بەدیهێنانی دەرفەتی یەکسانە بۆ هەمووان، مەڵێن پەیوەندی بە منەوە چییە؟ چاوی دەهاتە دەرەوە، دەبێت دوافلسیم بداتەوە...، دەبێت لەگەڵی بگونجێیت و بسازێیت، ئەمە واقعی ژیانە، هەر کاتێك تەواو گیرتخوارد بزانە توێکڵەکەت هەڵگرتووە و ناوکەکەت فڕێداوە.

بۆ نموونە کەسانێك ئاخر کاکە دەڵێن من ئێرانیم! ئێرانیت باشە بۆ خۆت ئێرانی بە، بڕۆ وەك خەشایارشا بژی، باپیرانی ئێمە گۆڕانیان دروستکردووە کە ئێمە بە ئێرە گەیشتووین، تۆیش دەبێت گۆڕان قبووڵ بکەیت و ڕێزی لێ بگریت، من ئێرانیم واتە شتێك دەخەمە سەر دۆزینەوەکانی باپیرانم و دەیهێنم بۆ ئێران، نەوەك هەرچی ئەوان گوتوویانە ئەوە بکەم، لە بیرتان نەچێت هەر کاتێك بینیتان دەست و باڵتان بەستراوە ئەم دەست و باڵ بەسترانە هی ئەوەیە کە بە هەڵە تێگەیشتووین، خەیالات و خورافاتمان وەرگرتووە، ئەگینا ئەسڵی هەر دین و کلتورێك بۆ گەشانەوەی ئەو گەلەیە، بۆ سازانیانە لەگەڵ یاساکان، یارمەتی بدەن تا گەشە بکات، نەتەوەی ئێمە دەبێت پێشکەوتووتر و شادتر و سەرکەوتووتر بێت، ئەسڵ ئەمەیە، ئەسڵ وەربگرن.

ئەو ترسانەی ئێمە هەمانە یەکێك لە گەورەترینیان ترسە لە شکست، (تۆماس ئەدیسۆن)، بۆ ئەوەی گلۆپ دابهینێت زیاتر لە شەش هەزار مادەی تاقیکردەوە، ئێوە بیربکەنەوە ئەگەر هەر مادەیەك یەك ڕۆژ کاتی بردبێت، دەزانن چەندێك کاتی خایاندووە؟ بیست ساڵ کاتی تەرخانکرد تا گلۆپی دۆزییەوە، بیست ساڵ! دوو هەزار و پێنج سەد تاقیکردنەوەی کردبوو پەیامنێرێك هات بۆ لای گوتی: بەڕێز ئەدیسۆ تۆ دووهەزار و پێنسەد جار لەم ڕێگەیەدا شکستت خواردووە هێشتا سووریت درێژە بەم کارە بێهودەیەت بدەیت؟ وەڵامی ئەو پیاوە مەزنە ئەمە بوو: گوتی: "گەنجی خۆشەویست، تۆ لە سادەترین یاسای جیهان بێئاگایت، من دووهەزار و پێنسەد جار شکستم نەخواردووە، من دووهەزار و پێنسەد ڕێگەی دروستنەکردنی گلۆپ فێربووم!"

ئێوە یەك هەوڵ دەدەن دەترسن شکست بخۆن، شکست ناخۆن فێر دەبن، ئێوە فێربوون ئەم سنوورە بشکێنن، دەی بیشکێنن، دیسان دووبارەی بکەنەوە، ئەمەیە ژیان، ئەمەیە گەشەکردن، ئەمەیە هەستکردن بە سوودمەندی، ئەمەیە هەستکردن بە ئەرزشمەندی و هەستکردن بە بوون...، ئێمە زۆر قسە دەکەین، بەڵام بە کردەوە زۆر لاوازین، من خۆم دەڵێم، وەکوو گوتم: لە شادی خانمەوە فێربووم دووبارە هەستمەوە.

دووەمین ترسمان، ترسە لە ڕەتکردنەوە. ترس لەوەی خەڵك پەسەندمان نەکەن، دەی با نەیکەن. خوشکان، برایان، کام گەورە،

کام پێشەوا، کام پێغەمبەر، کام ڕێبەری سیاسی و ئاینی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی...، لە دنیادا هەیە قسەی کردبێت و لە سەرەتاوە خەڵك پەسەندیان کردبێت؟ حەزرەتی محمد پێغەمبەرمان درودی خوای لەسەر بێت بەختەوەرترینیان بووە، ویستیان بیکوژن، پێغەمبەرانی تریان کوشتووە، هەر کاتێك تۆ بەشوێن پەسەندکردنی هەمووانەوە بیت، دەبێت هەواڵێکی ناخۆشتان بدەمێ، ئەو کەسەی بە شوێن پەسەندکردنی هەمووانەوە بێت، دەبێت بە کەسێکی ئاسایی. کەسی ئاسایی هەرگیز شتی نائاسایی دەستناکەوێت، دەبێت ئەم سنوورانە بشکێنین، پێیان خۆش نییە؟ دەی با پێیان خۆش نەبێت، تۆ ئیشی سەرەکی خۆت بکە، ئەوە بکە کە باوەڕت پێیەتی، ئیتر لای خەڵك ڕاستە یان نا، ئەوە کێشە نییە. من هەندێك لە پیاوانم دیوە بۆ نموونە: لەبەر چاوی خێزانەکەیان ڕێز لە هاوسەرەکەیان ناگرن، بە قوربان و بەساقەیان نابن...، وادەزانێت ئەگەر بەساقە و بە قوربانی ببێت سوکایەتی بە دایکی کردووە، یان ژنەکە وادەزانێت ئەگەر مێردەکەی بەساقە و بەقوربانی خوشك و براکانی بێت ئەمی خۆش ناوێت! شتی وا نییە، هەر کەسەو جێگەی خۆی هەیە، دەبێت فێر ببین، ئەمە ڕەتکردنەوە نییە، دەربڕینی ڕای خۆمە، من ئەوم خۆش دەوێت، تۆیشم خۆش دەوێت...، ئەمانە ئەو ترسانەن کە لە گوندی خوێدا دەمانهێڵنەوە.

یەکێکی تر لە ترسەکانمان ترسی گۆڕانە. خودی گۆڕان خۆی مەترسیدارە، من ماوەیەك لە یەکێك لە کارگەکاندا خەریك بووم ئیشم دەکرد، بە کرێکارەکانم دەگوت: دەمامك ببەستن، دەیانگوت: کاکی ئەندازیار دەمامك بۆ ناسك و نازدارەکانە! یان پشتوێنی سەلامەتی نابەستین، بۆچی نایبەستین؟ پشتوێنی سەلامەتی هی ناسك و نازدارەکانە! من دیومە کاتێك بەلای پۆلیسی هاتووچۆدا دەڕوات قایشەکەی دەهێنێتە لای کەلەکەی ڕاستی و کە تێپەڕ بوو بەری دەدات! هەڵبەت ئەم ڕەفتارە کاردانەوەیە، هەست دەکات بە زۆر پێی دەکەن، بەم کارەی دەیەوێت بڵێت من زۆر قبووڵ ناکەم، لەبەرژەوەندی خۆتە ئازیزم، ئەسڵەن یەکێك هاتووە و تفەنگێکی خستووەتە سەر سەرت و دەڵێت ئەم خواردنە بخۆ، تۆ کارت چییە دەی بیخۆ ئیتر، عەقڵت بخەرەکار، بەرژەوەندیت بخەرەکار، کاردانەوە مەنوێنە، ئەگەر گوتیان پشتی چاوت برۆیە، خێرا کاردانەوەت نەبێت و مەڵێ پشتی چاوی باوکت برۆیە! بڵێ زۆر سوپاست دەکەم کە سەرنج لە من دەدەیت.

ترس لە گۆڕانیش یەکێکە لەو ترسانە، دەی دیارە ڕانەهاتووین لەسەر بەستنی پشتوێنی سەلامەتی، لەسەر فلان خواردن.. هتد، دیارە پێشتر جۆرێکی تر دەژیاین، ئێستا ژیان گۆڕاوە، دەبێت خۆمان بگونجێنین، ئەگەر دەتوانین باشتری بکەین، هەروەها زۆربەی جار ئەمە بۆ گەورەکان دەڵێم، گەنجەکان ئەمە ببیستن زۆر

خۆشحاڵ دەبن: "بە زۆری نەوەك هەمیشە، زۆربەی جار کە من باسی ئەزموونەکانم دەکەم خەریکم باسی ترسەکانی خۆم دەکەم، ئەم کارە نەکەیت فێڵت لێ دەکەن، نەڕۆی بۆ ئەوێ فێڵت لێ دەکەن، یەکێك ئەم کارەی کرد ماڵ وێران بوو، ئەمانە ئەزموونەکانمە، باسی ئەزموونەکانی خۆم دەکەم، ئەزموونەکانم ترسەکانمە، واتە خەریکم ڕەهەندەکانی گوندی خوێکەم بۆ منداڵەکانم، بۆ کارمەندەکانم... باس دەکەم! کاکە گیان ئەم وەك من بیرناکاتەوە، بڕۆ پێشەوە بزانم چی دەکەیت.

دەڵێن کاکە ئەم قسانە چییە بڕۆ ئەو ئیشە بکە پارەت دەست دەکەوێت، کێ گوتویەتی دەبێت سی یان چل ساڵ ئیش بکەم تا ئەم پارەیەم دەست بکەوێت؟ ڕێگەی تازە تر هەیە، دونیا گۆراوە، ئێستا کەسێك دێت شتێکی تازە دروست دەکات وەك یاهوو، گووگڵ، فەیسبووك... هتد، دەبێت بە ملیاردێر، ڕۆژی سی هەزار بۆ چل هەزار دۆلاری دەست دەکەویت! دەی دونیا گۆڕاوە، من هێشتا بەیانی تا ئێوارە هەر بلێم تا ڕەنج نەکێشیت ناگەیت بە گەنج! دەی بیگۆڕە، من ئەم شێعرەم گۆڕیوە: ئەوەی عەشقی نەبێت بە گەنج ناگات، ئەو کەسەی عەشقی نەبێت گەنجی نییە، ئەو کەسەی گەنجی دەست ناکەوێت عەشقی نییە، نە بۆ خۆی، نە بۆ ئەوانیتر، نە بۆ ئامانجێك، نە بۆ ئایندەیەك. تکایە ترس لە ئەزموونەکانتان بکەنە دەرەوە. هەواڵێکە، بلێ سوپاس، بڕۆ کاری خۆت ئەنجام بدە. هەر لەبەر ئەمەیە کە گەورەکان ڕێگە لە

گۆڕانەکانمان دەگرین، ئەسڵەن ئێمە هەروەك مامۆستاکەمان بە ڕەحمەت بێت دەیگوت: "پرسێکمان نییە بەناوی پرسی گەنجان، ئەوە پرسی پیرەکانە لە گەنجەکاندا ڕوو دەدات!" گەنجەکان پرسێکیان نییە، گەنج یارمەتی بدە، ڕێگەی پێنیشان بدە و ئازادی بکە، ئەوەندە هێز و توانای گۆڕانکاری پێیە دەتوانێت دونیا بگۆڕێت.

لە هۆڵەندا هەندێك پرۆژەیەی دەوڵەتی هەیە کە ئەسڵەن بە کەسانی ناسراوی نادەن، بە گەنجانی دەدەن، دەڵێن هەرچەندە پرۆژەکەت حولحولی تر بێت زیاتر گوێی لێ دەگرین! پرۆژەی حولحولی یانی چی؟ یانی پرۆژەیەك کە لەژێر ڕێسا و دیسپلینی ئێمەدا نییە، واتە ئێمە خۆمان بە عاقڵ دەزانین و جگە لە خۆمان بە نەفام، ئەمە هەڵەیە، ڕەنگە ئێمە لە نەفامیدا بین کێ چوزانێت؟ ئێمە بانگەشەی وا دەکەین، ڕێگە بە گەنجەکان بدەن ئەوان دەتوانن ژیان باشتر بکەن، بزانن چەند باشتر دەبێت، چونکە بووە، لە کوێ ڕویداوە کە گۆڕانکاریی قبوڵ بکەن و ژیانیان باشتر نەبێت؟ ڕێگەکە بکەنەوە با گەنجەکانمان بیرۆکەکانی خۆیان تەرح بکەن، جێگەیەکیان بۆ بکەنەوە جیاوز لە ڕێسای ئێمە بژین بزانن ژیانمان باشتر دەبێت یان نا؟ لە هۆڵەندا شوێنێکی وا هەیە بودجەی بۆ تەرخان دەکەن، لە کەنەدا چەند بانکێك هەیە پارە بە گەنجەکان دەدات پێنج هەزار تا دە هەزار دۆلار پارە دەدات بۆ پرۆژەی گەنجەکان، هەرچەندە گەنجتر بێت زیاتر یارمەتیت دەدەن و فێری

دەکەن، پێت دەڵێن بیرۆکەکەت بهێنە یارمەتیت دەدەین، سەیر لەوەدایە هەر ئەم بیرۆکە بچووک بچووکانەیە کە گۆڕانکارییە گەورەکان بەدی دەهێنن، کۆمپانیا گەورەکان ناتوانن ئەم گۆڕانکاریانە بکەن، وشکبوون، کۆمپانیا گەورەکان سەرمایەگوزاری دەکەن تۆ وەك خاوەن بیرۆکەیەك کارەکە دەکەیت، دێن بە چەند ملیۆن دۆلار لێتی دەکڕن. پارەیان هەیە بەڵام بیرۆکەیا نییە، تۆیش دەتوانیت بیرۆکەی خۆت تەرح بکەیت، تکایە ڕێگە بدەن بیرۆکەکان بدرەوشێنەوە.

دەکرێت بە ڕۆژێك ڕێگەی سەد ساڵ ببڕین؟ مامۆستا من ڕێگەیەك دەزانم، دانیشە بزانم! من باپیرەیشم ئەم کارەی نەدەزانی چ بگات بە تۆ! دەی ناهێڵیت گەشە بکات خۆ دەزانێت! قورسترین کاری ئێوە کارێکە دەمەوێت لە چوارچێوەی چیرۆکێکدا بۆتان بگێڕمەوە:

"دیۆژن فەیلەسوفێکی یۆنانی بوو کەسێکی لاوازی بەرگشڕ، لەبەر ئەوەی قسەی زۆر زلی دەکرد، خەڵك و حوکمەتی ئەسینا خۆشیان نەدویست، ڕۆژێك دادگایەك پێکدەهێنن و تاوانباری دەکەن بە کوشتنی کەسێك، لەبەر ئەوەی کەسی نەکوشتبوو پێی دەڵێین لێت خۆش دەبین بەڵام دەبێت بۆ هەمیشە ئەسینا بەجێ بهێڵیت، ئایا بەرگرییەکت هەیە لە خۆتی بکەیت؟ (سەیرە ئەو کاتە دادگا هەبووە!) دیۆژن ئەم پیرەمێردە لاوازە هەڵدەسێت

دەڵێت: "ئەی دادگای بەڕێز، ئەی خەڵکی ئەسینا، منیش ئێوە مەحکوم دەکەم بەوەی تاکۆتایی تەمەن لە ئەسینا بمێننەوە!"

ئەم قسانە چین سزات دەدەین ئەسینا جێ بهێڵیت؟! منیش مەحکومتان دەکەم تا کۆتایی تەمەن لە گوندی خوێدا بمیننەوە.

مەترسە لە قسەی خەڵکی، خەڵکی هەرچی دەڵێن با بیلێن، تۆیش خەڵکی، تۆ چی دەڵێیت؟ قسە و ڕای تۆیش وەك هەموان گرنگە، تۆیش قسەی خۆت بکە، سەیر لەوەدایە من گوێ لە قسەی تۆ دەگرم و تۆ گوێ لە قسەی من دەگریت و هەموومان گوێ لە قسەی یەکتر دەگرین و هەموومان قسە بۆ یەك دەکەین و کەسیشمان نازانین چیمان دەوێت! دەی ئەمەیە کێشەی ئەمڕۆی ئێمە کەس قسەی لێناکات، کاکە مەگەر دەتوانی قسەی لێ بکەیت؟ تۆ کردت؟ ئاخر ئەتگرن، کاکە تۆ ئێرە ناناسی لە دەرەوە بوویت، شتی وانییە برا و خوشکەکانم، هەر ئەم گۆڕانکارییانەی لە وڵاتی ئێمەدا ڕوویانداوە هەمووشتێك دەگۆڕێت و بەرەو باشیش دەڕوات، با بەشداریی بکەین، ڕای خۆمان دەربڕین، لە خۆمانەوە دەست پێ بکەین، ئیتر با دەمان دابخەین و دەست پێ بکەین و کارێك بکەین، هەیە دەڵێت کاکەگیان فەرمانگەکانی حوکمەت پشتی پیاو دەشکێنن، ئێ باشە فەرمانگەکانی حوکمەت کێ بەڕێوەیان دەبات؟ من و تۆین ئیتر!

من کە دەچمە سەر کار دەڵێم خوایە یارمەتیم بدە ئیش و کاری ئەو خەڵکە بەڕێ بخەم، تۆیش یارمەتی خەڵك بدە خواش

یارمەتیت دەدات، دەی باشە ئەگەر بچیت بۆ فەرمانگەکەت و کات بەفیڕۆ بدەیت، مەگەر حوکمەت کێیە؟ خۆ لە ئەستێرەی مەریخەوە نەهاتووە، هەمووی هەر خۆمانین، هەر من و تۆین ئیتر! ئێمە دەمانەوێت خۆمان لە کێشەکان بدزینەوە و بەرپرسیارێتی قبووڵ نەکەین، کارێك بکە و لە خۆتەوە دەست پێ بکە، هەر ئێستا دەست پێ بکە، ئەوکارە باش بێت و پاڵنەرەکەی با عەشق بێت و بوونیادنەر بێت. ئەوەندە داوای ئەوە مەکە ئەوانیتر پەسەندت بکەن، چونکە ئەوانیش بەدوای پەسەندکردنی تۆوەن، هەمووومان کڕیاری کاڵایەکین، هەروەها جیاوازیشمان زۆرە.

ئێستا دەبێت چی بکەین بۆ ئەوەی بەسەر ترسەکانماندا زاڵبین و ڕەهەندی تازە بکەینەوە؟ دەبێت (ئازادبوون) هەست پێ بکەین و تاقیی بکەینەوە، نەوەك (ئازادی)، (ئازادیمان هەیە)، با ئازادبوون تاقی بکەینەوە و لە قەفەزی خۆمان بێینەدەرەوە، نەك لە قەفەزی ئەوانیتر، کەسی تر نەهێنینە ناو قەفەزەکەمان، بڵێ کاکە پێویست ناکات تۆ بێیتە ناو قەفەزی منەوە من خۆم دێمە دەرەوە. چی بکەین؟ یەکەمین هەنگاو ئەوەیە دان بنێن بە ترسەکانماندا، واتە باوەڕ بکەین کە دەترسین، قەبوولّی بکەین کە دەترسین، مەڵێ من کەم و کورتیم نییە، مەڵێ کێشەم نییە، دەبێت قبوولّی بکەین، سەرەتا قبوولّکردنە، دەبێت بشزانین ئەم ترسانە لە چ کاڵایەکن، کاڵاتی ترس بیرکردنەوە و وروژانە، وزەیەکە، یانی چی؟ مادده نییە، نادیارە، بیرکردنەوەیەکە و

هەستێکە، ئەگەر بتەوێت ئەمە لە خۆت بکەیتە دەرەوە دەبێت چی بخەیتە شووێنەکەی؟ ئەمە خراپە تۆ باشەکەی بهێنە، ئەمەش دەبێت بە چی؟ عەشق! کاتێك عەشقت هەبوو ترسەکان دەچنە لاوە، من دەڵێم ئەسڵەن ترسێك لە ئارادا نییە، (ترس واتە نەبوونی عەشق)، کاتێك مرۆڤ عەشقی نییە دەترسێت، پێناسەی تاریکی چییە؟ واتە نەبوونی ڕووناکی، هەر ئەوەندەی مۆمێك دابگیرسێنین ترسناکترین تاریکی دەڕەوێتەوە، ترس واتە نەبوونی عەشق، نەبوونی پاڵنەر، نەبوونی مانا. بۆچی دەبێت بگۆڕێم؟ بۆچی دەبێت بێمە دەرەوە؟ لەسەرەتاوە گوتمان لە گوندی خوێدا نازانیت کە سەوزەڵانی باکووریش هەیە ئاگادار نیت، بە تیشکی مەعریفەت ژیانتان ڕووناك بکەنەوە.

بۆ نموونە: وا بزانە سواری ئۆتۆمبیلێك بوویت هەواش تەمومژاوییە، جادە تاریك و پێچاوپێچە، چۆن دەتوانیت لە شەقامێکی تاریکی تەمومژاوی پێچاوپێچدا شۆفێریی بکەیت؟ پشت بەچی دەبەستیت؟ لەو دۆخەدا تەنیا پشت بە دوو گلۆپی سەیارەکەت دەبەستیت، لایتەکان دە مەتر ڕووناك دەکەنەوە و ڕێگاکەش سەد کیلۆمەترە، گرنگ نییە ئەوسەری جادەکە نابینیت، گرنگ ئەوەیە دە مەتر دەبینیت، بە ئەندازەی دە مەتر بڕۆرە پێشەوە، دە مەتر لە پێشترەوە دە مەتری دیکە دەبینیت، تۆ دەتوانیت هەر ساتێك دە مەتر ببینیت، بۆیە پێویسە هەنگاو

بنێیت، لە ژیانتدا بەشوێن دڵنیاییدا مەگەڕێ دەست پێ بکە و بجووڵێ و هەنگاوبنێ.

ئەمەی بۆتانی دەگێڕمەوە چیرۆکی ژیانی خۆمە: من لە بەریتانیا میوانی یەکێك لە هاوڕێکانم بووم، گوتی: بابچین بۆ فڵان شوێن شتێك بکڕین، گوتم: باشە با بڕۆین، سواری ئۆتۆمبیل بووین سوکانی ئەوان بە پێچەوانەی ئێمەوەیە چونکە سوکانی ئەوان لای ڕاستەوەیە من وامزانی سەرپێچی دەکات، جادەکەش تەمومژاویی و پێچاوپێچ بوو، کاتێك سەیرمکرد ئەو تاریکییە خەستە تەنیا بە ڕووناکی دوولایت دەڕەوێتەوە، گوتم: ئەمە ژیانە مەحموود گیان، ئێمە کۆتایی ڕێگەکە نابینین بەڵام دەبێت بەرەو پێش بڕۆین، هەروەك چۆن گەورەترین لەنێوبەری تاریکی ڕووناکییە، ئاوەهایش گەورەترین لەنێوبەری ترس عەشقە، عەشقە وادەکات بەبێ ترس هەنگاوبنێت، هەرکاتێکیش هەنگاوت نا دیوارەکانی ترس دەڕوخێن، کەواتە ئەگەر دەتەوێت سەرکەوتووبیت، هەنگاو بنێ و مەترسە، یەکەم هەنگاوبنێیت دەبینیت هەنگاوی دواتر ئاسانتر دەبێت.

فیلم کارتۆنێك هەبوو بەناوی (عەلی بابا)، بۆ ئەوەی بە خواستەکەی بگەشتایە، دەبوو لەگەڵ دێوێکی زەبەلاحدا بجەنگێت لە پێناوی عەشقەکەیدا، شمشێرێکی پێ بوو چووە ناو پەرستگەیەکەوە، دەستی کرد بەشەڕکردن لەگەڵ دێوە گەورەکەدا، لەوکاتەشدا چرایەك لە پشەوە داگیرسابوو، لە پڕ دێوەکە پیای

کێشا و شمشێرەکەی فرێدا، کاتێك نوشتایەوە بۆ ئەوەی شمشێرەکەی هەڵبگرێتەوە بینی سێبەرەکەی کەوتووەتە سەر دیوارەکە، بەڵام کاتێك ئاوڕی دایەوە بینی سێبەری دێوەکە لەسەر دیوارەکە نییە! بە ئارامی شمشێرەکەی هەڵگرت و هەستایەوە و گوتی: تۆ خەیاڵێك زیاتر نیت، پاشان بوو بە دوکەڵ و چوو بە ئاسماندا، ئەو دێوە هێمایە بۆ دێوی خەیاڵی من و تۆ، ئێمەین لە خەیاڵی خۆماندا وەهم و ترس دروست دەکەین، تەنافێکی ترسمان کردووەتە ملی خۆمان و هەمیشە دەڵێین ناهێڵن، نابێت، ناتوانم، چونکە باوەڕمان بەم خەیاڵات و ترسانە کردووە ئیش بۆ ئەوە دەکەین تا بیسەلمێنین کە ناتوانین! لە کاتێکدا توانامان هەیە و زۆریش بەهێزین، بەڵام چونکە نا واقعیین هەمیشە سەرگەردانین. (ئەنتۆنی ڕابینز) دەڵێت: ئەگەر بڵێیت دەبێت و ئەگەر بڵێیت نابێت تۆ لەسەر حەقیت.

لە ژیاندا هەرچەندە بێهیواتر و لاوازتر بیت، فشارەکان لەسەرت زیاتر دەبن، هەرچەند عاشقتر بیت، مەودای گەشەکردنت زیاتر دەبێت، گرنگ نییە لە کوێدایت، ڕەنگە کەسێکی هەژار بیت، ڕەنگە کەمێك وزەت تێدابێت، بەڵام ئەگەر عەشقت هەبێت، دنیا دەگریت! بۆیە بەعەشقەوە بژی و داوای شتی باشتر بکە، کەواتە ویستن دەبێت هەنگاونانی لەگەڵدا بێت، واتە قسە و خەیەیاڵات بخە لاوە، دەبێت هەنگاو بنێیت، ئەوەی دیواری ترس دەڕوخێنێت هەنگاو نانە، دەبێت هەنگاو بنێیت، گەرچی

هەنگاوێکی بچووکیش بێت، وەك لایتی سەیارەکە دەبێت دابگیرسێت و بەڕێ بکەویت. ئەگەر ئۆتۆمبێل ڕاوەستێت دە مەتر پێش خۆی ڕووناك دەکاتەوە، بەڵام کاتێك بەڕێکەوت دە مەتر دە مەتر ڕووناك دەکاتەوە, واتە هەنگاو بە هەنگاو، هەرکاتێك ترسایت, ناڵێم مەترسە بترسە و هەنگاو بنێ.

دووەمین کار کە دەبێت بیکەین بۆ ئەوەی بەسەر ترسەکانماندا زاڵبین و لە گوندی خوێ بێینەدەرەوە گوتمان یەکێك لە دیوارەکانی ترسەکانمان باوەرەکانمانە، باوەڕەکان زۆر کۆنترۆڵکارن، ئەگەر باوەڕتان وابێت گۆڕان سەختە، هەروەك لای زۆربەمان وایە، بە کەسێکی ئاسایی بڵێ کاکە ئەم کۆڵانە دەرناچێت، یەکسەر دەڵێت: ئۆو..، دەست دەکات بە بێزاری دەربڕین، یان هەیە دێتەوە بۆ ماڵەوە ژنەکەی دەڵێت پیاوەکە شقارتەمان نەماوە، ئاه, دیسان شقارتەمان نەماوە! یان کابرا دێتەوە بۆ ماڵەوە دەڵێت میوانم هێناوە، ژنەکە بەبێزارییەوە دەڵێت ئاه, دیسان میوانی هێناوە! بۆچی بێزاردەبێت؟ چونکە دەبێت هەندێ گۆڕانکار بکات، گۆڕانیش لە مێشکیدا واتە کێشە، بەڵام کەسی سەرکەوتوو گۆڕان لە مێشکیدا یەکسانە بە دەرفەت، گۆڕانی زیاتر یەکسانە بە دەرفەتی گەورەتر، یان بۆنموونە: دەڵێن کاکە بومەلەرزە تەواوی شاری وێرانکرد، کەسە عادییەکان دەڵێن ئۆو...، دیسان بەڵاو موسیبەت! بەڵام کەسە سەرکەوتووەکان دەڵێن ئێستا دەرفەتە، خەڵکی زیاتر پێویستیان بە منە, دەبێت چەندین خانوو، جادە...

هتد. دروست بکرێت. دەتوانم خزمەتی زیاتر بکەم، لە نێوو دڵی شتەکاندا زۆرترین دەرفەت شاردراونەتەوە بەو مەرجەی بیرورِای خۆت بگۆریت، دەبێت پێناسەی بکەیت لە مێشکی خۆتدا گۆران بۆ تۆ چ مانایەکی هەیە ئازادبوون یان زیندان؟ بۆیە ئەگەر دەتەوێت سەرکەوتوو بیت کاتێك باسی گۆڕان و گۆڕانکاری دەکەن لەبری ئەوەی لێکدانەوەکەت ئەوەبێت بڵێیت' تەواو دۆخەکە خراپ بووە و بەرەوخراپتریش دەڕوات و دەست بکەیت بە بێزاریی دەربرین و کات کوشتن و وزە سەرفکردن لە قسە و شتی بێسوددا، یەکسەر بڵێ گۆڕان یەکسانە بە: دەرفەت، خزمەت، شادی، ئاوەدانکردنەوە، سەروەت، ئازادی زیاتر... هتد. ئەو کەسەی کە عادیی بیردەکاتەوە ئەگەر پێی بڵێن سیمینارێك، کتێبێك، خولێکی پەروەردەیی یان وۆرك شۆپ...هتد، هەیە' بەشداری بکەیت ژیانت دەگۆرێت و باشتر دەبێت، یەکسەر لەبری ئەوەی بیر لە سوودەکانی بکاتەوە بیر لە نرخەکەی دەکاتەوە و دەڵێت وای چەندگرانە دە هەزار دینار؟! لەکوێی بهێنم؟ لەبەرئەوەی وەك گوتمان دەبێت ئامادەبیت بۆ گۆڕان، یەکێك لەوشتانەی دەبێت بیگۆڕیت خۆتیت، هەروەك چۆن کات و پارە بۆ هاوسەر و منداڵەکانت تەرخان دەکەیت، ئاواهیش دەبێت پارە و کات بۆ خۆت' تەرخان بکەیت، ئەگەر من بمەوێت بگۆڕێم دەبێت تێچوونەکەشی بدەم، هەرچەندە ئێوە بگۆڕێن، هەرچەندە ئێوە ساماندارتر بن، هەرچەندە شادتر بن، وڵات جوانتر دەبێت، بۆ

ئەوەی بتوانی یارمەتی هەژاران بدەیت دەبێت وەك ئەوان هەژار نەبیت، بۆ ئەوەی یارمەتی نەخۆشەکان بدەیت، دەبێت وەك ئەوان نەخۆش نەبیت، دەی بگۆڕێ کات و پارە بۆخۆت دابنێ، دەرفەت بۆ خۆت بەدی بهێنە تا گەشە بکەیت، هەمیشەیش بۆ لای باشترینەکان بڕۆ.

تۆ جاری وا هەیە چوار سەعات کات دادەنێیت بۆ کارێك، هەزار دینار بۆ هەر سەعاتێك و دەڵێیت ئەگەر سەعاتی یەکەم باش نەبوو دووەم، دووەم باش نەبوو سێیەم، سێیەم باش نەبوو چوارەم...، یاخوود شتێك دەکڕیت دەڵێیت ئەگەر باش نەبوو دانەیەکی تر دەکڕم، ئاخر ئازیزم هەموو ئەمانە کات و وزە و بیرکردنەوەت دەبەن و دەبێت کارەکەت جێبهێڵیت، هاتووچۆ بکەیت و مەسرەف بکەیت، بۆیە هەمیشە کارەکانت با باشترین بێت، ئەوکەسانەی دەیانەوێت باشترین بن هەمیشە لەگەڵ باشترینەکان هاتووچۆ دەکەن و لەگەڵ باشترینەکان ئیش دەکەن و خۆیان بە باشترینەکان دەناسێنن، گەورەترین سەرمایەی ئێوە کاتە، من ئێستا سەد دۆلار بدەم ئایا دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ سەعاتێك پێش ئێستا؟ نەخێر، یەك ملیاردیش بدەم ناکرێت، ئایا لەو کاتەوە تا ئێستا گۆڕاویت یان نا؟ باشتر بوویت یان نا؟ ئەگەر باشتر بوویت براوەیت، ئەگەر باشتر نەبوویت دۆڕاویت.

من وەك مەحموودی موعەزەمی کە ئێستا تەمەنم شەست و دوو ساڵە ئەسڵەن چاوەڕێی ئەوە لە خۆم ناکەم کە کەسێکی کامڵ

و بیٚ عەیب بیٚخەوش و بیٚ کەموکورتی بم، ئیٚوەیش چاوەڕیٚی ئەوە لە خۆتان و لە هیچ کەس مەکەن، ئیٚمە مرۆڤین، دەبیٚت دانووستان بکەین و لە یەکترییەوە شت فیٚر ببین، دەبیٚت یارمەتی یەکتری بدەین، هاوکاری یەکتری بکەین شارەکەمان و وڵاتەکەمان ئاوەدانتر بکەینەوە، ببینەی مایەی سەربلندی بۆ نەوەکانمان کە ئەگەر سبەینیٚ منداڵەکانمان ویستیان لە سەفارەتیٚك ڤیزایان پیٚ بدەن، بە ئاسانی وەری بگرن و بە شانازییەوە باسی وڵاتەکەی خۆیان بکەن، ئەمانە هەمووی لە ئەستۆی من و تۆ دایە. من ئیٚستا بەرهەمی کەڵە زانایان و بیرمەندانی دیٚرینی ئەم نیشتمانەم، دەبیٚت کاریٚك بکەین ئایندەمان ڕووناکتر ببیٚتەوە، ئەسلەن ئیٚمە پیٚویستمان بەوە نییە کامڵ بین، هەرئەوەی کە دەیزانیت ئەنجامی بدە کافییە.

ئیٚمە مامۆستایەکمان هەبوو چوو بۆ سەفەریٚك و کەسیٚکی دیکەی لەجیٚی خۆی دانا، کاتیٚك جیٚگرەکەی هات نەیگوت من ئەم وانەیە نازانم و نەمخوویٚندووەتەوە، هات موحازەرەی مامۆستاکەی خستە سەر میٚزەکەی بەردەمی و دەستی کرد بە خوویٚندنەوەی، پاشان تا ئەو شوویٚنەی لەبەری بوو دوور دەکەوتەوە و شەرحی دەکرد و پاشان دەگەڕایەوە سەیریٚکی دەکرد و دوور دەکەوتەوە یەعنی های وانەکەم لەبەرە و خۆم دەیزانم، ئیٚمە چاوەڕیٚی ئەوەمان لیٚ نەدەکرد، پاشان سەیر ئەوە بوو پەنجەرەکە کرابووەوە و با هاتە ژوورەوە و چەند لاپەڕەیەکی لەگەڵ خۆی برد،

ئەویش بەدوای لاپەڕەکاندا ڕایدەکرد و دەیخووێندنەوە! ئێمەیش

قاقا پێدەکەنین، ئەو پێی سەیر بوو ئێمە بۆچی پێدەکەنین؟ ئەو

جۆرە کەسانە چاوەڕێی نابەجێیان لە خۆیان هەیە، قەیچێکا با من

هەزار هەڵە بکەم، ئەسڵەن خۆشی ژیان لەوەدایە، بە کەسێکیان

گوت دەتەوێت ببیت بە پاشا؟ گوتی نا، گوتیان بۆچی؟ گوتی ئاخر

دەرفەتی بالآیی تێدانەماوە.

هەڵبەت ئێمە ئاینی جۆربەجۆرمان هەیە بەڵام من چونکە

موسڵمانم دەگەڕێمەوە بۆ ئیسلام، ئێمە لە ئایینەکەماندا دەڵێت

"چرکەساتێك بیرکردنەوە بەرامبەرە بە حەفتاساڵ عیبادەت."

بۆچی ئەمە گوتراوە؟ ئەوکەسانەی وەك ڕاهێنان ئەم کارە دەکەن

دەزانن بۆچی، چرکەساتێك دانیشە و بیر بکەرەوە، "توکل -

پشتبەستن"نالێم، بیرکردنەوە دەڵێم، دانیشە بیربکەرەوە، ئێمە

دەبێت کرۆکی قورئان وەربگرین کە بیرکردنەوەیە، ئێوە بیربکەنەوە

زۆرشتتان بۆ دەردەکەوێت، "بیرکردنەوە دەروازەی دەرچوونە لە

گوندی خویێ!" بۆچی؟ لەبەرئەوەی گوتمان ئێمە هەموو ڕۆژێك

بەیانی هەمان ئەو کارە دەکەین کە دوێنێ کردوومانە، شەو

هەمان ئەو بەرهەمە دەدورینەوە کە دوێنێ شەو دووریومانەتەوە،

بۆڵەبۆڵ دەکەین و هەم دیسان سبەینێ ئەو کارە دەکەینەوە،

بیرکردنەوە واتە ڕاوەستانی ڕۆتین و بەستنی پەیوەندی لەگەڵ

بوونەوەر و گەردوون، وزە وەرگرتن، زانیاری وەرگرتن،

دانوستانکردن... ئێمە لە (مەکتەبی کەماڵ)دا، ڕاهێنانمان هەیە،

دوو تا سێ جار لە شەو و ڕۆژێکدا، پانزە خولەکمان هەیە بۆ خەڵوەت و سکوت و بێدەنگی، دووانیان زۆر گرنگە، شەوان بەرلەوەی بخەویت پانزە خولەك بێدەنگ بە، نە ڕادیۆ، نە تەلەفزیۆن، نە ڕۆژنامە، نە گۆرانی و نە قسەکردن، نە هیچ، تەنیا بێدەنگ بن، حەزەدەکەن چاوداخەن، حەزدەکەن چاو بکەنەوە، بەڵام تەنیا پانزە خولەك بێدەنگ بن، ئەو پانزە خولەکە نە قسە بکەن و نە گوێ لە قسە بگرن. تەنیا لەگەڵ خۆتا خەڵوەت بکە. بەیانیش پێش ئەوەی لە نێو پێخەفەکەت بێیتەدەرەوە پانزە خولەك بیربکەرەوە خەڵوەت بکە لەگەڵ خۆتدا، وەك منداڵێك کە بەرانبەر پەنجەرەیەك دانیشتووە و خەریکە تەماشا دەکات، سەیر بکە بزانە چی لە بوونتدا دەگوزەرێت؟ داوەری مەکە، مەڵێ ئەمە باشە یان خراپە، کاتێك پانزە خولەکەکە تەواو بوو بڵێ خواحافیز دەبێت بڕۆم، ئەگەر ئەمکارەت ئەنجامدا باشترە نیوەڕوانیش ئەنجامی بدەیت، بەڵام شەوان و بەیانیان حەتمەن ئەمکارە بکەن، دەبینن وەك با و بروسکە لە گوندی خوێ دێنە دەرەوە، دەڵێیت ئەمە چ کارێك بوو من دەمکرد، مە چ کارێکە من دەیکەم، ئەسڵەن من بۆچی شەڕ دەکەم؟! ئەوسا پەی بە حیکمەتی ئەم گوتەیە دەبەیت: (چرکەساتێك بیرکردنەوە لە حەفتا ساڵ عیبادەت باشترە.) چونکە ئەو ناسینەی تۆ لە بیرکردنەوەدا پێی دەگەیت هیچ کات بە کردەوەی وشك پێی ناگەیت، چونکە بیرکردەوەیش خۆی کردارێك و هەنگاوێکە، حەتمەن دەرفەت بە خۆتان بدەن، من ژنان و پیاوانێکم

بینیوە کە دەگەنە سنووری خۆکوشتن بەڵام ڕاناوەستن، تەپ دەکەون و تاوێك ڕانامێنن. چوونە دەترسن سەیری خۆیان بکەن. دەترسن لەوەی لە ڕەفتاری خۆیان بڕوانن، دەترسن لەوەی بزانن لە گوندی خوێدان...، تکاتان لێ دەکەم بترسن و هەنگاو بنێن، بترسن لە ڕۆتینەکانتان، بترسن لەوەی کە ناچارن بگۆڕێن و بەرەو دنیایەکی نەناسراو بڕۆن، تکا دەکەم بترسن بەڵام هەنگاو بنێن، کەسی ئازا ئەو کەسەیە کە دەترسێت بەڵام هەنگاو دەنێت، دەستپێکەکەیشی بیرکردنەوەیە، سەیر ئەوەیە پێتان بڵێم ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ خۆمدا لەمبارەیەوە دروستم کردووە، من ئێستا ئەو کەسانەی سەفەریانکردووە لەگەڵمدا دەزانن، لە ناکاو دەچمە ژوورێکەوە و ڕادەکشێم یان لەسەر کورسییەك دادەنیشم، لە (ڤانکۆڤەر)یش، ڕەفتاری من دەناسن، یان خەریکم بە کەنار دەریا پیاسە دەکەم یان دانیشووم، "مرۆڤ لە بێدەنگیدا گەورە دەبێت." هاوڕێیان ئەمە خاڵێکی گرنگە، تەواوی پێغەمبەران لە خەڵوەت و بێدەنگیدا بوون، بەجۆرێك شوان بوون، ناچار بوون بێدەنگ بن، قسە مەکەن، قسە مەبیستە، هەموو پەیوەندییەك بپچڕێنە با گەورە بیت، ئەمکارەش ترسی تێدایە، تاڵە، بەڵام بەرەکەی شیرینە، بێدەنگ بە تا گەورە بیت.

بەڵێ کاتێك بێدەنگ بوویت بۆت دەردەکەوێت کە بۆچی دەڵێن "لە سەر بێشکەوە تا ناو گۆڕ زانست بخوازە."کام ئایین بەم ڕاشکاوییە خوازیاری گەشەسەندنی زانست بووە؟"دەستخستی

زانست لەسەر هەر ژن و پیاوێکی موسڵمان فەرزە." ئێوە سەیری ئێستا مەکەن ئەم قسانە دەکەین بگەڕێینەوە بۆ هەزار و چوارسەد ساڵ لەمەوبەر، لەناو هۆزێکی دەشتەکیدا ئەم قسانە کراوە، "داوای زانست بکە ئەگەر لە (چین)یش بووە"، "هەر دیلێك پێنج موسڵمان فێری خوێندەواری بکات ئازاد دەبێت." بەینی خۆمان و خودا، ئێستە ئێمە بەرهەم هێنەری زانستین یان ئەوانەی شوێنکەوتەی پێغەمبەری ئێمە نین؟ بۆچی ئاخر؟ لەپێناوی چیدا؟! من لە تەورات و ئینجیلدا شوێنێکم بەو ڕوونییە نەبینیوە کە سەبارەت بە ئەرزش و گەورەیی زانست قسە بکات و ئەوەندە بە پێویستی بزانێت، بۆچی لە زانست بێ بەهرەین؟ بۆچی زانست بەرهەم ناهێنین؟ بۆچی پێمان وایە هەرچی زانستە دەبێت لە دەرەوە بێت؟ بۆچی هەر چی ستاندەرە لە دەرەوە دێت، بۆچی خۆمان دروستی نەکەین؟ بۆچی خۆمان هەناردەی نەکەین؟ ئەمە بیرکردنەوە وەڵامت دەداتەوە کوێی کارەکەت هەڵەی تێدایە، لە کوێدا توێکڵت هەڵگرتووە و ناوکت فڕێداوە، ئێمەش دەتوانین زۆر گەشە بکەین، بە هەزار و یەك هۆکار دەتوانین پێش بکەوین، چونکە ئەو خوێندکارانەمان کە لێرە دەرناچن، کە دەچن بۆ تاراوگە پلەی باڵا بە دەست دەهێنن، کۆمپانیای گەورە بەڕێوە دەبەن هەر ئەوانەی کە لێرە دەرنەدەچوون پێیان دەڵێن گێژ و تەمبەڵ، کەواتە شوێنێکی کارەکەمان هەڵەی تێدایە. بێدەنگ بە، زۆر لە خۆت مەکە و ڕاوەستە بزانە کێشەکەت چییە؟ هەر

ئەو بێدەنگییە پێت دەڵێت! با بیر بکەینەوە بۆچی بەجۆرێك خاوەنی هەمووشتێکین و هاوکات هیچ شتێکیش نین؟ ئێمە وەڵامەکەی دەدۆزینەوە و دۆزیومانەتەوە و زیاتریش دەدۆزینەوە.

ئاماریان وەرگرتووە کە لە سەدا دوو تا لە سەدا سێی ترسەکانمان واقعین، لە سەدا حەڤدەش شایەنی پێش لێگرتنن و لە سەدا هەشتایان پوچن، واتە کاتێك دەترسیت و ترست هەیە یەکسەر بە خۆت بڵێ لەسەدا هەشتای پوچ و بێمانایە، لە سەدا حەڤدە شایەنی پێش بینییە، من لە ژیانمدا تەنیا لە سەدا دوو مافی ئەوەم هەیە لە شتێك بترسم کە نازانم چییە، ئەوەشیان پشت بەخوا ببستە پارێزراو دەبیت، لە سەدا دوو بترسە بەڵام نەوەك هەمووی، ئەوەی من بە ئێوەی دەڵێم خۆم موو بە موو لە سەختترین هەلومەرجدا ئەنجامم داوە، بەڵێنتان پێ دەدەم دەکرێت، هەمیشە ئەمەتان لەبیر بێت لەسەدا هەشتای ترسەکانتان پووچە، لەسەدا حەڤدەیش شایستەی پێش لێگرتنە و تۆ بۆت هەیە لەسەدا دوو بترسیت، تکایە لەمە زیاتر مەترسن.

ئایا دەتەوێت بزانیت ئەندازەی گوندی خوێ یان قەفەسەکەت چەندە؟ نیشانەیەکت دەدەمێ بۆ ئەوەی بزانیت: سەیرێکی حسابی بانکییەکەت بکە، سەیریکی پەیوەندی ژن و مێردایەتیت بکە، سەیرێکی منداڵەکانت بکە، سەیرێکی هاوڕێکانت بکە، سەیرێکی باری کۆمەڵایەتیت بکە. چەندێك خۆشحاڵیت؟ چەندێك متمانەت بە خۆت هەیە؟ ئەمانە هەمووی نیشانی دەدەن کە چەندێك

قەفەسەکەت بچووك یان گەورەیە، ئەگەر پارەت نییە هی ئەوە نییە کە پارە نییە، دەفرەکەت بچووکە، حەزرەتی (مەولانا) عاشقی شەمس بوو، قوتابییەکانی ئیرەییان پێ دەبرد دەیانگوت تۆ پیر و موریدی ئێمەیت، تۆ دەڕۆیت بە شووێن ئەم پیرەمێردە بەرگدڕاوەدا؟ زۆر (شەمس)یان ئازاردا و دواجاریش ئاوارەیانکرد حەزرەتی (مەولانا) شیعرێکی گوتووە وەسفی حاڵی ئەوکاتەیەتی دەفەرموێت: "ئەوەی دەیڵێم بە ئەندازەی تێگەیشتنی تۆیە، مردم لە تاو حەسرەتی تێگەیشتنی دروست، ئەگەر دەریا بڕژێتە گۆزەوە چەند دەگرێت؟ بە ئەندازەی ڕۆژوو شکاندنێك."

ئێمە لەم زەریای فراوانی نیعمەتانە، لەم زەریای فراوانی عیشقە، لەم زەریای فراوانی ئارامی و خۆشگوزەرانییە چەندێك هەڵدەگرین؟ ئێمە دەتوانین بە ئەندازەی دەفرەکەمان هەڵبگرین، هەندێك کەس دەفرەکەیان بەقەد پەرداخێك ئاوە، بۆنموونە: ئەگەر پەرداخێك ئاویان پێداین دەبێت بیخۆینەوە کە خواردمانەوە دووبارە بۆمان پڕ دەکەنەوە، بەڵام ئەگەر بە پڕی بیهێڵینەوە بۆمان تێناکەنەوە، دەبێت یان بیخۆین یان بەکاری بهێنین، ئینجا دووبارە بۆمان تێدەکەنەوە، سنووورداری لە زەریادا نییە سنووورداری لە دەفرەکەی من و تۆدایە، ئەگەر خۆت کات بۆ خۆت تەرخان نەکەیت، ئەگەر خۆت ڕێز لە خۆت نەگریت، ئەگەر خۆت بۆ خۆت سەرمایەگوزاریی نەکەیت، ئەگەر خۆت بۆ خۆت دەرفەتی خووێندن نەخەیتە بەردەمی خۆت، چۆن چاوەڕێ دەکەیت ئەوانیتر

بۆتی بکەن؟! دەریا نایەت بۆلای تۆ، تۆ دەبێت بچی بۆلای دەریا، من دەمەوێت ڕێگەیەکتان فێر بکەم، ئەو ڕێگایەی کە خۆم هەوڵ دەدەم پێدا بڕۆم، ئازیزم تۆ دەتەوێت بەردەوام بۆت پڕ بکەن و بیخۆیتەوە، من شتێکتان پێ دەڵێم: "بڕۆنە نێو زەریاوە، کەس هیچتان پێ ناڵێت" لێرەدایە کە مەولانا دەفەرموێت: "دڵۆپێك زەریایە، کاتێك لە زەریایە، ئەگینا ئەو دڵۆپە و زەریا زەریایە" بڕۆ ناو زەریاوە کەس ڕێگەت لێناگرێت خۆشحاڵیش دەبن، بەرەکەی تۆ بە ئەندازەی ئەم دنیایەیە، تۆ ئاوا خەلقکراویت، خۆت وا بیر دەکەیتەوە، دەڵێیت دایك و باوکم ئاوا پەروەردەیان کردوم، ناهێڵن... هتد، وەڵامەکەیتان لە کۆتایی ئەم بابەتەدا دەدەمەوە.

ئازیزانی من جارجارێك ڕاوەستن سەیری قەفەسی گوندی خۆییەکەتان بکەن، پرسیار لە خۆتان بکەن بڵێن: من شایەنی ئەمەم؟ من ئاواهی دەبێت بژیم؟ من دەبێت تەنها ئەوەندە خۆشحاڵ بم؟ بۆچی هاوسەر و منداڵەکانم خۆشحاڵ نەبن؟ بۆچی دراوسێکانم چێژ لە بوونی من وەرنەگرن؟ بۆچی من بۆ شارەکەم سوودمەند نەبم؟ بۆچی کاریگەری باش لەسەر وڵاتەکەم دانەنێم؟ بڵێ بەشی من لە دنیادا چییە؟ خەشایار و کۆرش و داریوش تەواو بوون، دەبێت بپرسین ئێمە چیمانکردووە؟ ئەوە دوو هەزار و پێنسەد ساڵ لەمەوبەر بوو، ئەبوعلی سینا و حافز و سەعدی و ئەوان کاتی خۆی هەبوون دەستیان خۆش بێت، ئێستا حافز و سەعدی و زەکەریای ڕازی و خەیامەکانی سەردەمی ئێمە کێن؟

ئێوەن، بسمیلا دەست پێ بکەن، باوکی من فڵان کەس بوو سوودی نییە، ئێوە چیتانکردووە؟ ئێوەش دەست پێ بکەن و دنیاش چاوەڕێی ئێوەیە.

عیشق بکەن بە ڕێنمایی خۆتان و ڕق و کینە بخەنە لاوە، ڕق و کینە تەواوی وزە و توانای ئێوە لەناو دەبات و هیچ سوودێکی نییە جگە لە وێرانکاریی، ئەبوعەلی سینا بۆچی ڕێزی هەیە؟ لەبەر بیرکردنەوەکەی نەوەك لەبەر زانستەکەی، لە زانستی پزیشکدا ئێوە ئێستا خوێندەواریتان لە ئەبوعلی سینا زیاترە، ئێوە هەندێك شت دەزانن کە ئەبوعلی سینا ڕۆحیشی لێی ئاگادار نەبووە، ئێوە زۆر لە ئەبوعلی سینا باشتر دەزانن، سەبارەت بە ئەستێرەکان ئێوە زۆر لە خەیام باشتر دەزانن، بەڵێ هەر ئێوە، ئێوە تواناتان زۆرە هیچ شتێك ناتوانێت ڕێگاتان لێ بگرێت، مەترسن لەوەی کامڵ نین، ئێوە مامۆستای پۆلی یەکی سەرەتایتان خۆش دەوێت، بەڵام ئێستا ئەو مامۆستایە لە ئێوە زیاتر دەزانێت؟ نەخێر، بەڵام خۆشتان دەوێت، پەیوەندی بەوەوە نییە مەخوازن کامڵ بن، مەخوازن لە سەدا سەد بن، ئەم سنوورە پوچ و وەهمیانە بشکێنن، ڕێگە بۆ خۆتان و بۆ منداڵەکانتان و وڵاتەکەتان بکەنەوە، خەیاڵاتەکان بخەنە لاوە، وەهمەکان فڕێ بدەن، ئەمانە تارماین، وەك دێوەکەی عەلی بابا بوونی دەرەکیان نییە، خۆمان دروستمانکردووە من و تۆ دەتوانین ئەم کارە بکەین.

نیمە یەکجار دەژین، هەر کارێك دەتانەوێت لەم یەکجار ژیانەدا دەبێت بیکەن، کەسێك لە یەکجار ژیاندا دەبێتە خاوەنی هەمووشتێك، کەسێکیش لەم یەکجار ژیانەدا هەمیشە موحتاجی ئەم و ئەوە... هەڵبژێرن کەسێك بن ببنە خاوەنی هەمووشتێك و یارمەتی ئەوانیتریش بدەن و بەسوودبن بۆ کۆمەڵگەکەتان، لەو دەستەیەی یەکەم بن. چارەنووستان بگۆڕن، ئەوەندە ڕێگەی سادە بۆ دەوڵەمەندبوون هەیە کە خزمەتە بەوانیتر نەوەك شەڕ بێت، سەردەمانێك وا بوو ئەگەر تۆ دەوڵەمەند بوویتایە بەهۆی کەسانی ترەوە بوو، ئێستا بەهۆی خزمەتکردن بەوانیترەوە دەتوانیت دەوڵەمەند بیت، (بیل گەیتس) خەریکە خزمەت دەکات پارە پەیدا دەکات، ناتوانێت بەهۆی زەحمەتی ئەوانی ترەوە دەوڵەمەند ببێت، ئەو زەمانە بەسەر چوو دەبێت ڕێگە نوێیەکان فێربن.

بۆچی لە گوندی خۆیدا گیرمان خواردووە؟ دەترسین، ترس لە چی؟ لە گۆڕان، لە نەناسراوەکان، بۆچی لە مەرگ خراپترە؟ بۆچی پارە دەدەین و هەموو کارێك دەکەین تا نەگۆڕێین؟ چونکە خودی مەرگیش گۆڕانێکە! لە مەرگ خراپتر گۆڕانە، واتە ئامادەین بمرین بەس نە گۆڕێین، هەیە دەڵێت ئامادەم بمرم بەڵام نەگۆڕێم، یانی چی؟ گۆڕان بەلایەوە سەختترە لە مردن. بۆچی ئامادەنین بگۆڕێین؟ با جارێك تاقی بکەینەوە. ئەسڵەن بۆچی دەتەوێت بمریت؟ قسە بکە، گفتوگۆ بکە. لە مەرگ خراپتر گۆڕانە، چونکە خودی

مەرگیش گۆڕانە، "ئازیزان دەبێت (من) بگۆڕێت، کەی دەبێت بگۆڕێت؟ هەر ئێستا".

دەمەوێت ڕازێکی گەورەتان پێ بڵێم، ئەم ڕازە گەورەیەتان پێ دەڵێم کە ئەگەر بتوانم بە جوانی تێتان بگەیەنم گۆڕان بەلاتانەوە وەکوو ئاوی خواردنەوەی لێ دێت، ئەوانەی من دەناسن دەڵێن مەحموود ئێمە تۆمان نەدیوە دوو ڕۆژ، یەك هەفتە، مانگێك بە یەك شێوە بیت، هەر جارە و تۆ دەبینین بە جۆرێکیت و شتێکی تازە دەهێنیت، نەك ئەوەی شتە کۆنەکان باش نەبن...، دەبێت ڕێگەی تازە و باشتر بدۆزینەوە، مەبەستم ئەمەیە: "گوتمان ئێمە لە گۆڕان دەترسین چونکە هاوتای مەرگە" هەر وایشە، کاتێك بیروڕای خۆت دەگۆڕیت، ڕەفتارت، جلوبەرگت، دەگۆڕیت ئەمە گۆڕانە، مەرگی ڕاهاتنە، مەرگی بیروڕایە، مەرگی ڕەفتارە، مەرگی هەستەکانە، بەڵام ئێمە نامانەوێت بگۆڕێین، بۆچی نامانەوێت بگۆڕێین؟ من مامۆستایەکم ئینگلیزیم هەبوو لە کەنەدا خانمێك بوو، دەبلیوو لەگەڵ ئێچ من بە ڤێ تەلەفوزم دەکرد، دەمگوت: ڤێ، ڤێر ئاڕ یوو، لە کاتێکدا خۆی ئاوا دەخووێندرێتەوە: وێ، وێر ئار یوو، وەکوو چۆن کوردەکان دەڵێن وێ، دەبلیوو ئاوا دەخووێندرێتەوە، بەردەوام دەیگووت وێ، وێ.. منیش پێدەکەنیم و دەمگوت ڤێ، ڤێ.. دەیگووت: نەو ڤێ، وێ، وێ، دەمگوت: باشە وێ، باشە وێ چییە؟! دەیبیلێ ئیتر مامۆستات گرتووە و پارەت داوە تا فێری تەلەفوز بیت، دەبلیوو

ئیچ دەبێت بە وی، واتە دەبێت هەوا دەربکەیت و بڵێیت هوێ ئایو.. من گوتم بۆچی ئەوەندە بەرگریی دەکەم؟ لەبەر ئەوەیە من پێم وایە ئەگەر من بڵێم هوێ ئایو ئیتر من مەحموودی موعەزەمی نیم، لەبەر ئەوەیە فێرنابم، نەوەك نەتوانم فێر ببم، ئێمە دەڵێن مازەر، مازەر نییە، "مازە"یە. هەیە دەڵێت نا من دەڵێم برازەر، برازە، پۆزلێ دانە! فلانی دوو کەلیمە دەزانێت دەڵێت برازە! ئەمە بۆچی من ئاوا مقاومەم دەکرد؟ چونکە من ئیتر تەلەفوزم گۆڕاوە و پێم وایە مەرگی تەلەفوزی هەڵە، مەرگی خۆمە، بۆیە نامەوێت بیکوژم!

خوشکان و برایان ئێستاش بابزانین (کەسێتی) یانی چی؟ کەسێتی پێناسەیەکی گشتییە، کەسێتی دەڵێن کۆمەڵەیەکە لە ڕەفتار، کردار، هەست و باوەڕەکان، ئەو کاردانەوانەی کەسێك لە خۆی نیشانی دەدات، بۆ نموونە ئەگەر ناکۆك بین، هەندێك کەس پرسیار دەکەن، هەندێك کەس توندوتیژی دەنوێنن، هەندێکیش زویر دەبن.. کەسێتی واتە: ئەو کاردانەوانەی کە لە بەرانبەر بزوێنەرە دەرەکییەکاندا نیشانی دەدەین، واتە ئەگەر من جلوبەرگەکانم بە یەك شێوەبێتی، ئەگەر ڕۆژێك بمەوێت جلوبەرگێکی دیکە بپۆشم ناڕەحەت دەبم. بۆ نموونە: ئەگەر چاکەتێکی سوور لەبەر بکەم و قژم تاڵ تاڵ بکەم و عەینەکێکی ڕەش لە چاو بکەم و پانتۆڵێکی تەسکی چەرم بپۆشم و شێوە و جۆرێکی تر بنوێنم چی ڕوودەدات؟ من لەبەری ناکەم، بۆچی؟ واتە

ئیتر من مەحموودی موعەزەمی نیم، دەبم بە دیسکۆکان! وانییە؟
بەڵام من وەك مەحموودی موعەزەمی پێتان دەڵێم:

١ـ گەر پێویست بکات و ببێتە هۆی دروستکردنی کاریگەریی لەسەر ئێوە دەی پۆشم.

٢ـ لەبەر ئەوەی پێناسەی کەسێتی لە (مەکتەبی کەماڵ)دا شتێکی ترە.

لە (مەکتەبی کەماڵ)دا، ئێمە دەڵێین (کەسێتی) واتە شیاوێتی هەڵبژاردن، مرۆڤی خاوەن کەسێتی، ئەو کەسەیە کە شتی باش هەڵدەبژێرێت.

کەسێك هەبوو لەسەر موڵکێك شەڕمان بوو، کەسێکی زۆر شەڕانی بوو. ڕۆژێك چوو تفەنگێکی هێنا و گوتی: دەتکوژم! گوتم تۆ من دەکوژی؟! هەڵە دەکەیت مەگەر تۆ دەتوانی من بکوژی؟ بە کورتی دەمم لێکردەوە و دەستمان کرد بە شەڕە قسە...، من ئەو سەردەمە خەریکی خوێندنی ماستەر بووم، گوتی: تۆ بۆ ماستەر دەخوێنیت و ئاوا قسە دەکەیت؟ گوتم ماستەر واتە لاتوپوتێکی وەکوو تۆ، زائیدەن بیست ساڵ خوێندن، ئێستا کامیان هەڵبژێرم؟ من خۆ بۆ ئەوە نەمخوێندووە تۆ غەدرم لێ بکەیت کوڕی باش، من لوولتەکەم...، من لێرە ڕانەوەستاوم کەس مافم بخوات.

کەسێتی واتە ئەوەی تۆ بتوانیت ڕەفتاری گونجاو لەگەڵ ئەنجامی گونجاو هەڵبژێریت، نەوەك ئەوەی ئیتر چونکە خاوەن

کەسێتیم غەدرم لێ بکەن، لە (مەکتەبی کەماڵ)دا، ئێوە لە شوێنێکدا وەستاون کە مافی هەڵبژاردنتان هەیە، ئێمە بەگشتی نیشانەکان لەگەڵ خودی بابەتەکەدا بە هەڵە وەردەگرین، بۆ نموونە: ئەگەر ئێستا کەسێك بێت بڵێت مەحموودی موعەزەمی کێیە؟ ئێوە چ نیشانەیەکی پێ نیشاندەدەن؟ دەڵێن ئەوەی کە لەسەر تەختەی شانۆکە ڕاوەستاوە، ئەو پیاوەی کە چاکەتەکەی سورمەییە و بۆینباخەکەی زیرەییە و پانتۆڵەکەی کرێمیە و قۆنەرەکانی قاوەییە...، ئێستا ئەگەر کەسێکی تر لێرە بێت و هەمان ئەو نیشانانەی هەبێت، ئایا ئەوە مەحموودی موعەزەمییە؟ من دەچم جلەکانم دەگۆڕم و دێمەوە، بە من دەڵێیت موعەزەمی کێیە؟ دەڵێم منم، دەڵێیت نا ئەوەی چاکەتی سورمەیی لەبەرکردوە و بۆینباخی بەستووە...، دەڵێم منم، دەڵێیت نا ئەوەی چاکەت و پانتۆڵێکی وای لەبەردایە، ئازیزانم، نیشانەکانی ئەم کەسە ئەمەیە، خودی ئەم کەسە نییە، مەحموودی موعەزەمی جلوبەرگەکانی نییە، ئەمانە نیشانەکانی مەحموودی موعەزەمین ئێستا و لەم چرکەساتەدا، ئێوەش نیشانەتان هەیە، بۆ نموونە: دەڵێن ئەم پیاوە یان ئەم خانمە، توندوتیژە، نامیهرەبانە...، ئەمە نیشانەکانییەتی، خۆی نییە، خۆی ئەو کەسەیە کە بڕیاری داوە ئەم ڕەفتارە لە خۆی نیشان بدات.

ئێمە بەگشتی ئەسیری بیرکردنەوەکانی خۆمانین، بیرکردنەوە زادەی منە، ڕەفتار هەڵبژاردنی منە، ئەسیری بیرکردنەوەکانت

مەبە، ئێمە ئێستا ئەسیری خزمەتکارەکەی خۆمانین، ئێوە کەستان بینیوە خزمەتکاریی بۆ خزمەتکارەکەی خۆی بکات؟ کێشەی ئێمە لەوەدایە کە ئەسیری بیروباوەڕەکانمانین، ئەسیری ڕەفتارەکانمانین، ئەسیری هەست و دابوونەریتەکانمانین، ئەسیریی دنیابینیمانین...، (مەکتەبی کەماڵ) دەڵێت: لە دیلێتی وەرە دەرەوە، تۆ کەسێکی خەریکیت هەڵدەبژێریت، زۆربەی خەڵك دەڵێن کاکە باوباپیرانم هەروایانکردووە، ئاخر ئاوا نابێت، وایان بە ئێمە گوتووە...، دەی باشە کەواتە تۆ ئەوەت هەڵبژاردووە کە بیروباوەڕی باپیرانت لەگەڵ خۆت بهێنیت، تۆ ئەوەت هەڵبژرادووە درێژە بە منداڵی خۆت بدەیت، ئەگەر هەر بیرکردنەوە و ڕەفتار و نەریتێك تۆ ناکات بە مرۆڤێکی باڵاتر بیپچڕێنە، هەروەك چۆن ناوکیان بڕیت تۆیش بیبڕە تۆ هەڵتبژاردووە، تۆ هەڵتبژاردووە کەوا بیربکەیتەوە و پێت وابووە ئەمە دروستە...، بەدبەخت نیت، بەڵام بە هەڵە باوەڕت هێناوە و ئەوەت هەڵبژاردووە کە ئەگەر بەدبەخت بیت، لە قازانجتە! ئەو کەسانەتان دیوە کە لە چاڵی مەزڵومییەتدا گیریانخواردووە؟ بەردەوام ناڵە و بۆڵەیانە و هەستکردن بە گوناه لەوانیتردا بەدی دەهێنن؟! بۆ نموونە لە وڵاتێکی دیکەوە تەلەفون بۆ دایکت دەکەیت: سڵاو دایەگیان چۆنی باشی؟ "دایەگیان هەر تۆ باشبیت من ئیتر حسابم ڕۆیشووە!" لەوپەڕی شادی و خۆشیدا هەستی گوناهت تێدا دروست دەکات، هەرچی خۆشییە لە

گەروتەوە دەیهێنێتە دەرەوە! "تۆ لەگەڵ ژن و منداڵەکانتدا شاد بە من پیر بووم تازە!"

یان خانمەکان بۆ نموونە: خانم سەفەرەکەمان خۆش بوو؟ من لەبەر خاتری تۆ و منداڵەکان هاتم! ئەم ڕەفتارە هەڵمانبژاردووە، من ناڵێم ڕاستە یان هەڵەیە، پەیوەندی بە خۆیەوە هەیە، کەسێك ئەوەی هەڵبژاردووە کە هەمیشە وا بیر بکاتەوە کە ئەوانیتر زۆری لێ دەکەن، بۆ ئەوەی سیناریۆکەیشی تەواو بێت کەسێك دەدۆزێتەوە کە زۆری لێ بکات! یان کەسێك ئەوەی هەڵبژاردووە کە ستەم لێکراوبێت، کەواتە پێویستی بە ستەمکارێکە، دەڕوات دەیدۆزێتەوە، ئەگەر نەبێت، دروستی دەکات، ئەگینا دەورەکەی خراپ دەبێت! هەر بەو جۆرەی مۆدێلی جلوبەرگەکانت هەڵدەبژێریت. تۆ واقع دەخولقێنیت بە هەڵبژاردنەکانت.

من وەکوو مەحموودی موعەزەمی بۆچی لە سیمینارەکانم و بەرنامەکانی تەلەفزیوندا چاکەت و پانتۆڵ لەبەر دەکەم و بۆینباخ دەبەستم؟ لەبەر ئەوەی دەمەوێت یارمەرتی بینەران و بیسەرەکانم بدەم خێراتر پەیوەندیم لەگەڵدا بگرن و بزانن من چ جۆرە بیرکردنەوەیەکم هەیە...، قبووڵیانە بسمیلا، قبووڵیان نییە خواحافیز، ئەگینا من بە جلوبەرگێکی زۆر سادەشەوە دەتوانم بە ڕێگەدا بڕۆم.

کەسێتی ئەوە نییە کە تۆ ئەسیر و خزمەتکاری بیرکردنەوەکانی خۆت بیت، کەسێتی واتە من لێرەدا ڕاوەستاوم و هەڵدەبژێرم بۆ

نموونە: ئەمرۆ ئەم ڕفتارە ئەنجام دەدەم یان ئەم بیرکردنەوەیە، ئەم هەستە باش نییە دەیخەمە ئەولاوە، کاتێك هاتیت لەمبەرەوە ڕاوەستای تۆ دەرهێنەری ژیانی خۆتی، تەلاری بەختەوەریی خۆت دروستی دەکەیت. هەوڵی تۆ وەستایە و بەختەوەریش تەلارەکەیە، تەلاری بەختەوەری خۆت دروستی دەکەیت بە دەستی خۆت، ئەمەش ئەو کارەیە کە تۆ دەتوانیت بیکەیت.

هاوڕێیانی خۆشەویست بەڵام ئێمە چی دەکەین؟ ئێمە خۆمان تەپڵەکێکی چوار قاچمان دروستکردووە و ژیانمان لە سەری بیناکردووە. قاچێکیان قسەی خەڵکە، قاچێکیان ترسە لە گۆڕان، قاچێکیان ئەگەر شکستم خوارد و نەکرا چی، قاچێکیان من کەسێکی خراپ نیم...، ئێستا ئێمە بناغەی ژیانمان لەسەر ئەمانەیە: قسەی خەڵکی، ئەگەر نەکرا چی و ترسەکانی تر...، ئاوا بە لەرزە لەرز، یەکێك دێت ڕەخنەمان لێ دەگرێت و دەڵێت:

- من لەگەڵ ڕای تۆدا نیم...

تۆیش لە ترسا دەڵێیت بە خوا کاکە من مەبەستم ئەوە نەبوو، من وام نەگوتووە، من... هتد، بۆچی؟ چونکە خەریکە قاچێکی دەشکێنێت و دەکەویتە سەر زەوی، تۆش ناتەوێت بکەویتە سەر زەوی، بەرگریی دەکەیت لە بەرانبەریدا دەڵێیت: بەقوربانت بم، لە خزمەتتدام، ئەمرکە، ببورە نەمزانی... هتد، کەچی لە پاشملە دەڵێیت ڕاست نەبیتەوە، لە دڵەوە قسەی پێ دەڵێیت! چونکە دەترسیت قاچێکی بشکێت و بکەویتە سەر زەوی، بۆ ئەوەی پێت

ئەڵێن کەسێکی خراپە، یان بۆ نموونە کەسێکی باش و ڕێك و پێك نییە، دایك و باوکێکی باش نییە... بەڵام بەردەوام موجامەلە دەکەین. بەقوربانت بم، لەخزمەتتدام... هتد، خوشکان و برایان گوندی خوێی زۆربەمان بە ئەندازەی ئەو تەپڵەکەیە! هەمیشە خەریکین لە دڵەڕاوکێدا دەژین و دەترسین بکەوین، من داواتان لێ دەکەم بکەون. ئەم ترسانە دروستکراوی خۆتن، بیانخەلاوە و وەرە سەرزەوی، نە ناچاری کۆبوونەوە ساز بکەیت، نە ناچاری ماستاو بکەیت، نە ناچاری خۆت بچووك بکەیتەوە، ئازادیت، هەر بەو جۆرەی بەدیهێنراویت، ئەمە ژیانە سەیر بکە چەند توانات هەیە، بڕۆ پێشەوە مەترسە، سەیربکە چەند ئازادیت! وەك گوتم لێیاندام و گریام بەڵام دوایی خۆشحاڵبووم، بە لەقە لێیاندام گوتم بۆ لێم دەدەیت، تەماشا دەکەم کەوتوومەتە شوێنێکی باشرەوە! ئەمە ئەو ڕووداوەیە کە خەریکە سات بە سات و ڕۆژ بە ڕۆژ لە ژیانی من و تۆدا ڕوودەدات.

کاتێك منداڵ لە سکی دایکی دێتە دنیاوە دەگری، بۆچی دەگریی؟ چونکە شوێنێکی دڵنیای هەبوو هەمووشتێك ئامادە بوو، بەڵام ئێستا دەبێت خۆی هەناسە بدات، خۆی خواردن بخوات، بەڵام ئێوە دەزانن منداڵ ئەگەر دوای زیاتر لە ماوەیەك لە سکی دایکیدا بمێنێتەوە خۆی و دایکەکەیشی دەمرن! منداڵ کە گەورە دەبێت دەیانەوێت بیبەن بۆ قوتابخانە، دەست دەکات بەگریان و دەڵێت من دایکم دەوێت، بۆچی دەگری؟ چونکە دەترسێت لە

گۆڕان! دەیەوێت هەر لەو شووێنەی خۆیدا بمێنێتەوە و نەگۆڕێت، بەڵام دنیا پاڵی پێوەدەنێت، دەبێت سینەی دایکی بەجێ بهێڵێت، دەبێت بێتە خوارەوە خۆی بە ڕێدا بڕوات، دوایی دەچێت بۆ قوتابخانە دەگریی و داوای دایکی دەکات، بەڵام دایکی دەبێت بەوپەڕی خۆشەویستییەوە بینێرێت بۆ قوتابخانە، لەگەڵ هاوڕێیانی تازە ئاشنادەبێت و لە ماڵ دێتە دەرەوە، زەماوەند دەکات دەگری، منداڵی دەبێت دەگری، سەرقاڵ دەبێت دەگری، ماڵ دەگوازێتەوە دەگری، پیشەی تازە وەردەگرێت دەگری، خانم دیسان ئەرکێکی تازەیاندا بەسەرمدا، خەریکە باشتر دەبێت، لەگەڵ کەسانیتر ئاشنا دەبێت، خەریکە ڕەهەندی تازەی ژیان ئەزموون دەکات، بەڵام دەگریی! دواجاریش کاتێك دەمرێت لەگەڵ ئەوەی باوەڕی بەو دنیا هەیە دەگری! بەردەوام دەگری، چونکە لە مانای ژیان تێنەگەیشتووە، (هەموو ژیان ئەوەیە کە بێدەنگ نەمریت، شەپۆلین و ڕاوەستانمان مردنمانە، ئێمە بەوە زیندووین کە ئارام نەگرین).

ڕووبەڕوو بوونەوەی مرۆڤەکان لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا چەند جۆرێکە:

هەندێکیان لە گۆڕان تێناگەن و گۆڕان بە تەنیشتیاندا تێدەپەڕێت و دەمرن بێ ئەوەی بزانن گۆڕان چییە!

دەستەی دووەم بەرگریی دەکەن، پاش ماوەیەک ناچار دەبن گۆڕانەکان قبوڵ بکەن، وەک ئەو منداڵەی کە سینەی دایکی بەردەدات و دەچێت بۆ قوتابخانە و زەواج دەکات.

دەستەی سێیەم خۆیان ئامادە دەکەن بۆ گۆڕانکارییەکان، ئێوە لە دەستەی سێیەمن، دەمەوێت بەڵێنم پێ بدەن کە ئێوە نەک گۆڕان بەلاتاندا تیێناپەڕێت، نەک بەرگریی ناکەن، نەک خۆتان بۆ گۆڕان ئامادە دەکەن، بەڵکوو دەڕۆن بۆ ئەوەی گۆڕانکاریی بەدی بهێنن هەتا ئەو ڕۆژەی لە ژیاندان گۆڕانکاریی دەکەن.

دڵێکی شاد و لێوێکی پڕ لە خەندە بۆ هەموولایەک، خواتان لەگەڵ.



## چەند پرسیارێك:

- ئایا دەخوازن ئازاد و سەربەرز بژین؟
- ئایا دەخوازن شاد و سەربەز بژین؟
- ئایا دەخوازن هەم ئازاد و سەربەز بژین و هەم شاد و بە ئومێد؟

مەحاڵە مرۆڤێك، خێزانێك، میللەتێك، بیەوێت بگۆڕێت و بەرەو باشتربوون هەنگاو بنێت، خوای گەورە بەمیهرەبانی خۆی یارمەتی نەدات. ئەو شێوازە من بۆ بەیانکردنی بابەتەکانم هـەڵمبژاردووە شـێوازێکە بـەناوی: (ئـەکسلەرەیتد لێرنینگ accelerated learning) بە کوردی واتە: فێرکاریی خێرا.

لەم شێوازەدا من زۆر پرسیار دەکەم، بۆچی پرسیار دەکەم؟ لە زمانی ئینگلیزیدا دەستەواژەیەك هەیە کە دەڵێت: ( question hook the maind) واتە: (پرسیار لە مێشك وەکوو قولاپ گیردەبێت.) ئێستا ئێوە هەر بابەتێك کە پێتانخۆشە دەتوانن بیری لێ بکەنەوە، هەر بابەتێك بێت ئازادن فەرموون..

لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما 

نرخ (٣٠٠٠) دینار